جۆرج بالوشی هۆرفات

# ئەدیب و گزیری پۆلیس؛



## کێشەی ئەدەب و سیاسەت لە وڵاتە سۆشیالیستەکان

وەرگێرانی

محەمـەد هەریری

لەبڵاوکراوەکانی دەزگاری راگەیاندنی (ستاندەر)

- ئەدیب وگزیری پۆلیس کـێشـــەی ئـەدەب وسـیاسـەت لـە وڵاتـە سـۆشـیالیسـتـەکـان
- نووســینی : **جۆرج بالوشی هۆرفات**
- وەرگێڕانی: **محـەمـەد هـەریـری**
- نەخشـەسازی ناوەوە : **مستەفا فارس فاضـل**
- نەخشـەسازی بەرگ : **مستەفا ئیحسان عەبدوڵلا**
- ساڵی چاپی ئەلیکترۆنی: **٢٠١٥ - چاپ یەکەم - هەولێر**
- ناوی کتێب لە عەرەبىدا:"الادیب ومفوض الشرطه" دار الکاتب العربی للترلیف والترجمه - بیروت

زنجیرەی کتێب (١٧)




دەزگای راگەیاندنی ستاندەر

٢٠١٥

ماڵپەڕ: www.skurd.net
ئیمەیڵ: info@skurd.net

## پێشەکی

دوای شۆڕشی ١٧ی ئۆکتۆبەر لە ڕوسیا قۆناغێکی نوێ لە جولەی ڕۆشنبیری دروست دەبێت، بەبەراورد لەگەڵ رابردوو پاشەکشەی کرد، چونکە ئەدیبان و نوسەران و هونەرمەندان خرانە ژێر نەشتەرو کۆتی گزیرانی پۆلیس. هەر لە سۆنگەی ئەوەی کە ئەدەب بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی سیاسییە، بەسەدان نووسەر لەناوبران لە هەڵمەتی پاڵاوتن و لە بێژینگداندا، کە لە ئالقەی چوارەمی ئەو سەدەیە ئەنجام درا، لەم کتێبەدا گوزەرانی بەشێك لە ئەدیبان و نوسەران دەخاتە بەرباس، کە چۆن کەوتونەتە بەر شاڵاوی جەورو ستەم و پاکتاوی جەستەیی لەلایەن حزب لە وڵاتە سۆشالیستەکان. هەروەها تیشکدەخاتە سەر ئەو حەرەکە سەقافییەی کە چۆن هەورازو نشێوی لە فۆناغە دیاریکراوەکان بەخۆیەوە دەبینێت.

ئەو کتێبە یەکێکە لە بەرهەمە وەگێڕدراوە ناوازەکانی (محەمەد هەریری)، کە بە زمانێکی پاراوی کوردی وەرگێڕانی بۆ کردوە، کتێبەکە لە نووسینی (جۆرج بالوشی هۆرفات)ە، بەزمانی عەرەبی، لە بڵاوکراوەی "دار الکاتب العربی"ـە.

لەم کتێبەدا، ئەدەبی سۆڤیەتی لە سەرەتای شۆڕشەوە بۆ چوار ماوەی سەرەکی دابەشکردوە، ماوەی یەکەم لە ساڵی (١٩١٧ تاکو ١٩٣٠) دەگرێتەوە. لەو ماوەیەدا نووسەر کەمێک سەربەستی پێدرا، بۆ ئەنجامدانی ئەزموون و داهێنانی ئەدەبی. لەدەورانی ١٩٣٠ زەبری کوشندەی سەردەمی ستالینی زۆر بەتوندی بەر پیاوانی ئەدەب کەوت. ئەوەش سەرەتای ماوەی دووەم بوو، ماوەی دیکتاتۆریەتی ستالین هەتا ساڵی ١٩٥٣ کە دەرگای کردەوە لەسەرماوە کورتەکەی سێیەم، کە پێی دەڵێن ماوەی (واڵابوون)، لەکاتێکدا ماوەی

(١٩٥٨ - ١٩٥٩) خۆی دەنواند وەکو دەرگا واڵاکردن لەسەر ماوەی چوارەم، کە قۆناغێکی توندڕەوی بەرەو دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری خرۆشۆف.

ماوەی دووەم کە بۆ ماوەی دوو پشت و دوو نەوەی لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتی خایاند، ئەو ماوەیە بە ناهەموارترین سەردەمی ئەدەبی سۆڤیەتی دژمێردرێت. ئاشکراشە کە نایابترین بەرهەمی ئەدەبی سۆڤیەتی لە دوو ماوەی یەکەم و سێیەمدا بەچاپ گەیەنرا، چونکە سەربەستیەکی رێژەیی لەو دوو ماوەیە هەبوو ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ماوەکانی تردا . لەو ماوانەدا، ماوەی کورت و درێژ لە بەبەرست کردن و واڵاکردن لە ئاڵو گۆڕدابوون بەپێی بارودۆخی سیاسی. هەڵبەتە رژێمی سۆڤیەتیش نموونەی حوکمی سەپێنراوە بوو بەسەر هەموو ئەو وڵاتانەی کە لەژێر چەپۆکی فەرمانڕەوای کۆمەنیسیدا دەژیان. سەردەمی ستالین خراپترین سەردمێکبوو بۆ نووسەران و ئەدیبان.

کۆمەڵەی نووسەرە ڕوسییە پرۆلیتارییەکان، کە ساڵی ١٩٣٠ هاتن، هەر بەتەواوی ژیانی ئەدەبی سۆڤیەتیان پاوان کردبوو، لە ساڵی ١٩٣٤ دەسەڵات گرتنێکی تەواو بەسەرمەیدانی ئەدەب سەپاند، لەو کاتەی کە گۆنگرەی یەکەمی یەکێتی نوسەرانی سۆڤیەتی بەسترا، یەکێ لەو خاڵە بنچینەییانەی یەکێتیەکە دەڵێ: ئامانج لە یەکێتیەکەمان بریتیە لە بەرهەم هێنانی ئەدەبێکی بەرزو لە پلەیەکی بەرزی هونەری، ئاوێتەبوو بەگیانی پاڵەوانیەتی و تێکۆشان و پرۆلیتاریای جیهانییەوە، تێکهەڵکێشراو لەگەڵ مەزنایەتی سەرکەوتنی سۆشیالیزم، ڕەنگدەرەوەی دانایی حیزبی کۆمەنیستیی بێت. هەروەها یەکێتی نووسەران و سندوقی ئەدەب وەکو شادەماری خوێنی ژیانی مادی نووسەران بوون. دەرکردنیش لە یەکێتییەکە واتا سڕینەوەی سیفەتی (نووسەر) لەبەردەم وشەی (پیشە) لە ناسنامەی نووسەران دا.

یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی دوورکەوتنەوەو پشت لێکردنی جەماوەر لە ئەدەبی هاوچەرخی سۆڤیەتی. دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رۆمان و دراماو کورتە چیرۆک و شیعرو سرودانەی کە هەڵبەستران بۆ ستایشکردن و بەشانوباڵا هەڵگوتنی ستالین و دارودەستەکەی.

ستەمکارانی سۆڤیەت بە ١٦ ساڵ دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری بەسەر ئەدەبدا سەپاند، لە ساڵی ١٩٣٤ زاڵبوون، بەڵام لە چین هەموو هەنگاوەکان لە ماوەیەکی پێوانەیی کورت و زۆر بەتوندوتیژو دلڕەقانە هاوێشتران کە بووە هۆی کوشتنی سەدەها نوسەرو زیندانکردنی هەزارانیش .

هەروەها لەم کێبەدا باسی جولەی نووسەرو ئەدیبانی هەنگاریاو پۆڵۆنیاو ئەڵمانیاش دەکات. نووسەرو ئەدیبانی هەنگاریا یەکەم کەس بوون کەلە رووی دیکتاتۆریەتی کۆمەنیستی ڕاپەڕین. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا بزوتنەوەی دژایەتی ستالینیزم هەر لەزووەوە لە هەنگاریا دەستی پێکرد.

هەرچەندە ڕژێمی کۆمەنیستی هەوڵیدەدا گەل تێبگەیەنێت، کەوا گزیرانی پۆلیس شەڕی چینایەتی دەکەن لە پێناو ئەوان و بەرژەوەندی ئەوان. بەڵام ئەدیب و نووسەران بەپێچەوانەوە، هەست و سۆزی "گەل"ـیان جۆش دەدا، چونکە ئەوەی بە چاوی خۆیان دەیان دیت بۆیان دەخستنە قالبی ئەدەب و بۆیانیان بەدیار دەخست، کەوا ژیانی داماوی و تۆقێنەریان هەرگیز ناشێت ببێتە بنچینەی بەختیاری مرۆڤایەتی لە ئایندەدا.

## ئــاری عەبدوڵڵا

## دەستپێك

"لەمەوبەرو ئێستاو لەمەو دواش حزبی کۆمەنیستی بەتەنها فەرمانڕەوایە لەسەر بیرو هۆشمان دەربڕی ڕاو ئاوەتەکانمانە، هەروەما سەرکردەو ڕێکخەری گەلە لە گشت قۆناغەکانی خەباتیدا لەپێناوی کۆمەنیزمدا" **پراڤدا: ٦ی گەلاوێژ ساڵی ١٩٥٦**

"تاکایەتی دوژمنی هەرەگەورەی سەربەستی باڵایە" **پراڤدا**

"حیزب بەبازوی پۆڵایی خۆی دەجەنگێ لەدژی پێدزە (تسلل) کردنی هەر بیروباوەڕێکی نامۆ بۆ ناو ئەدەب و هونەردا. پێویستە چەکی ئایدیۆلۆژیمان هەردەم ئامادەو تەیاربێت و بەبێ ساتمەکردن کار بکات" خرشۆف لەلێدوانێکیدا لە یەکیەتی نوسەرانی سۆڤیەتدا لە ساڵی ١٩٥٧. "پێویستە ئەدەب ببێتە ڕەوڕەوە وبورغی لە ئامێری مەزنی حیزبدا" **لینین لە کتێبی (ڕێکخستنی حزبی).**

"پێویستە بابەت و بوارەکانی کارە ئەدەبیەکان سنورداربن: ئەدیب بۆی هەیە یا ستایشی کۆمەڵگای نوێ بکات، یانیش ڕەخنەکانی ئاراستەی کۆمەڵگای کۆنی گەندەڵ بکات" **شانغ هین شۆ: لە کۆنگرەی نوسەرانی چین.**

"تاک ڕەوێتی بورژوازی سەرچاوەی هەموو شەڕو خراپەیەکەو دوژمنی یەکەمی کۆمۆنیزمیشە. بۆیە بەبێ لەناو بردنی تاکڕەوێتی ناتوانین کۆمۆنیزمی بنیات بنێین" **لوی لینگوی: سەرۆکی یەکیەتیەکانی بازرگانی لە چین.**

"نەیاری کردنی حیزب واتا خیانەت کردن و کاوڵکردنی وڵات و کارەسات هێنان بۆ نەتەوە کەمان" **ماوتسی تۆنگ**

# ئەدەب و گزیری پۆلیس

**لینینیزم:** ئەدیبەکان شەڕێکی ناچارین (شئْ لابد منە) دەڵێن ناپلیۆن دەربارەی شاعیر گوتویەتی: بێ گومان شاعیر مرۆڤێکی بەهرەمەندە فێری دانانی هۆنراوە بووە هەروەک چۆن سەرباز فێری مەشق دەبێت، بۆیە پێویستە شاعیر گوێ ڕایەڵی فەرمانی سەرۆکەکەی بێت هەروەک چۆن سەرباز گوێ ڕایەڵی لە فەرمانی سەرۆکەکەی دەکات. بەڵام ناپلیۆن لە هەموو بارودۆخێک دا ئەو گوێ ڕایەڵیەی بە شاعیراندا ڕەوانەدەدیت. بەڵکو لێی ڕادەدیتن لەچەند کارێکی گرنگ ئەو گوێ ڕایەڵیە بنوێنن، بۆ نموونە: هاریکاری بکەن بۆ پوژاندنەوەی گیانی وڵات پارێزی و ئازایەتی لە خەڵکی فەرەنسادا هەروەها کار بکەن بۆ (دابینکردن و پاراستنی وڵات).

زۆرترین و توندترین و ڕێکترین هەوڵ کەدرابێ بۆ بەردەست کردن و سەرپێ نەواندنی ئەدیبان، لەلایەن ڕژێمە کۆمەنیستیەکانەوە دراوە لە سەدەی بیستەمدا. بەڵام ئەزمونە گەورەکانی ئەدەب دەیسەلمێنن کەوا ئەو هەوڵ و تەقەلایانە ئاکامی هەردەم سەرنەکەوتنە، هەتا ئەگەر هاتوو ئەو ئەنجامە لە ڕێگای پشت بەستنمان تەنها بەسەرچاوە کۆمەنیستەکان بنیات بنێین. لەو کتێبەی بەردەستتدا ئەو ڕێبازەمان گرتۆتە بەر.

شاعیر ناتوانێ گوێڕایەڵی فەرمانەکان بێت و بەمویەک لێی لانەدا هەتا ئەگەر خۆشی بیەوێت، چونکە شاعیر (یاهەر نوسەرێک) ناتوانێ مل کەچ بێت بۆ فەرمانەکان، هەر چەندە بە پەرۆشیش بێت بۆ مەسەلەیەک یان بۆ ڕێبازێک. شاعیر ناتوانێ وەکو سەربازەکانی ناپلیۆن مل کەچ بێت و گوێڕایەڵی بکات، چونکە سەربازو شاعیر دوو جیهان و دوو شتی لەیەک جیان، جیاوازی ئاسمان و رێسمانیان هەیە.

لەو بابەتەدا مرۆڤ توشی چورتم و چەپۆکێکی زۆر دەبێت، چونکە ئەوانەی بەشداری لەو درامایە دەکەن هاوەڵن لە یەک تیپ دا، بیانەوێ یا نەیانوێ بەریەک دەکەون و دەکەونە بەربەرەکانێ، دەتوانین ئەو درامایە ناو بنێین (ئەدیب و گزیری پۆلیس) ئەو دووانەش بە شێوەیەکی حەتمی هەر سنگ و بەرۆکی یەکتری دەگرن. لەسەردەمی کۆمۆنیزمیدا ئەدیب و نوسەر و هونەرمەندان شەرێکی ناچاری و قیرسیایین، چونکە لە داب و نەریتی بیروباوەڕی کۆمۆنیستیدا ئەو کۆمەڵگایەی کە لەڕۆشنایی بیروباوەڕی مارکسیزم و لینینزم دا دەڕۆن بەڕێوە، بە پێشکەوتوترین و بەرزترین جۆری کۆمەڵگاکانی تردادەنرێت.

لەبەر ئەوە دەبێت مارکسیزم و لینینزم ڕێبەر بێت لەبواری هونەردا. بەڵام ئەوەی هونەرمەند و ئەدیبان بە بەرهەمی دەهێنن لەژێر پاڵپەستۆو زۆرە ملێیدا شتێکی وا ناقۆڵایە کە هەرگیز بیر و

هۆشی ڕۆشەنبیران پێیان هەرس ناکرێت. بەڵام هەر کە تروسکایەک سەربەستیان بەدی کرد هەر ئەو ئەدیب و هونەرمەندانە دەبنە زمانێک کەتەنها نارەزایی وبێزاری دەردەبڕن.

هەموو ئەو سەردەمانەی کە کۆمەنیستی فەرمان ڕەوا بووە. دەبینین بەناچاری دەمێک فشاریان زیاد کردوەو دەمێکی تر خاویان کردۆتەوە، دەمێک نازی ئەدیبانیان کێشاوەو دەمێکی تر لەسێدارەیان داون و هەڵیان واسیون.

# مێژووی ئەدەبی کۆمەنیستی واتا مێژووی تۆقاندن

مێژوی ئەدەب لە ماوەی زیاتر لە چڵ ساڵدا لە ڕوسیاو ئۆکرانیا کۆمارە سۆڤیەتییە ئاسیایەکان، هەروەها لە لاتڤیاو لیتوانیاو ئستونیا لە ساڵی ١٩٤٤ـوە، هەروەها لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و پۆڵۆنیاو چیکسلۆفاکیاو هەنگاریاو ڕۆمانیاو بوڵغاریاو ئەلبانیا لە ساڵی ١٩٤٥ـوە، لە کۆتاییدا لە چین و ڤێتنامی باکورو کۆریای باکور لە ساڵانی ١٩٤٩-١٩٥٠ـیەوە. مێژوی ئەدەب لە نێوان ئەو ساڵانەدا لەو وڵاتانەدا ماوەیەکی باش و بە پێزمان دەداتە دەست بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتەی کە مەبەستمانە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە ئێمە هەرگیز پشت نابەستین بە جگە لەو ڕاستی و بەیان نامانەی کە بەڵگە نامەکانی کۆمەنیستی خۆیان دانیان پیا ناوە بە ئاشکرایی، یا پەخش کراوە لەو ئێزگانەی کە لە ژێر ڕکێفی حکومەتن یا لەو وڵاتانە چاپکراون کەلە خولگەی یەکیەتی سۆڤیەت وچین دا سوڕ دەکەن .

تا ئێستا کەس لیستەکی ناوی ئەو نوسەرانەی دانەناوە کە لەجیهانی کۆمەنیستیدا لە سێدارە دراون کە ژمارەیان هەزارەهایە بە دان پێهێنانی ڕاپۆرتە ڕەسمیەکان. ئەوانەش کە بەند کراون یا تا ئێستا لە زیندانن ژمارەیان دەیان هەزارە.

هەروەها لیستی ئەو گۆڤارە ئەدەبی و هونەریەی ساڵانەو مانگانەو ڕۆژانە کە قەدەغە کراون زۆر درێژە، ئەو ئەدیب و

هونەرمەندانەی کە لە لیستی ڕەش تۆمارکراون ژمارەیان دەیان هەزارە.

ئەو نوسەرە سۆڤیەتیانەی کە بەتونترین شێوە هێرش کراوەتە سەر بەرهەمەکانیان لەلایەن بیرۆکراتیەکانی حیزبدا. نموونەی "بلنیاکو ، زوشانکۆ ، ئیخماتۆڤ ، دورنتسێڤ و باسترنام" ئەوانە تەنها نین بەڵکو هاوەڵێکی زۆریان هەن لەو وڵاتانەی لە ژێر چەپۆکی کۆمەنیستی دان .

## ناسازی حەتمی لە نێوان
## بەهرەی ئەدەبی و پاوانکردنی حیزب

بەر لەوەی دەست بکەین بە نمایشێکی کورتی چارەنووسی نووسەرانی هەر چوار گۆشەی جیهانی کۆمەنیست، واچاکە چاوێک بەو نەسازییە سەرەکیانەدا بخشێنین کەلە نێوان نوسینی بەرزو باڵای ناوەڕۆکدارو ڕژێمی کۆمەنیستدا دروست دەبن.

نەسازی لە نێوان بەهرەی ئەدەبی تاک و پاوان کردنی حیزبیدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە، چونکە حیزب سورە لەسەر چەپۆک بەسەر کردنی تەواوی ئەدەب و، سوریشە لەسەر بەداردەست کردنی ئەدەب، هەروەها بە ئاشکرا ڕق و قینەی خۆی دەنوێنی لە دژی بلیمەتی و بەهرەی تاک، سوریشە لەسەر پێکچونی شێوەو ناوەڕۆک، بۆیە دیکتاتۆریەتی کۆمەنیستی و ئەدەب لە بنچینەدا نەسازو ناکۆکن. ئەوەش بۆتە هۆی دوژمنایەتیەکی هەمیشەیی لە نێوان ئەدیب و گزیری پۆلیس بەهۆی جیاوازی نێوان سروشتی هەر یەکێکیان .

زمانیش لە ژیانی حیزبی کۆمەنیستدا ئامرازێکی گرنگ وورد وگەلێکیش ترسناکە. لە هەمان کاتدا زمان ڕۆلێکی گرنگی هەیە وەکو ڕآ ورەسمێک (گقوس)، بۆیە پێویستە بەکار بهێنرێت بە پێی ڕێنمویی ڕاستی تقوسەکان .

نووسینی (دەستەواژەیەکی چەوت) یان دەربڕینی ووتنی لە دوان و نوسینە حیزبیەکان دا. کارێکی پڕ مەترسیە، چونکە کەمترین لادان لە کلێشەی پەسنکراوی ڕەسمیدا کارێکی دەگمەنەو هەموو کەسێک زاتی کردنی ناکات. چونکە گۆڕینی کلێشەی دەستەواژەکان کاری تایبەتی ڕەهبەری باڵایە (پاسەوانانی بیروباوەڕ: ستالین یان خرۆشۆڤ یان ماو) یا کاری ڕەهبەرانی کەرتی ئابووری و ڕۆشنبیری و کەرتەکانی ترە.

ئەوەش وای پێویست کردوە لەسەر فەرمانبەرانی حیزب لە کاتی دەرچونی (دەستەواژەیەکی چەوت) لە زمان و پێنوسیاندا، ڕەخنەیەکی خودی توندو تیژ لە خۆیان بگرن. لەسەردەمی ستالیندا وا باو بوو ئەوانە حەواڵەی ژێر خاک بکرێن. بە گوێرەی گزیری پۆلیسیش، کەمترین گۆڕین و لادان لە دەستەواژەی سەرەکی تقوس دا مەترسیەکی گەورەیە. سەرکەوتنی گزیری پۆلیسیش، هەروەها ژیانیشی بەندە لەسەر توانای پاراستنی شێوەی سەرەکی پەسندکراودا. بۆیە گزیری پۆلیس لە شێوەی سەپێنراو دەترسێ ڕێزی لێ دەگرا.

جادروشمەکان ودەستەواژە تقوسیەکان دەگۆڕێن بە پێی گۆڕانی پلان و ستراتیژیەتی حیزب.

پێویستە لەسەر گزیری پۆلیس لە کاتی پێ هەڵگەڕانی بە پەیژەی پڕ مەترسی پلەو پایەی حیزبدا، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەموو ڕووداوێک و مەسەلەیەک لە ژیانی تایبەتی و گشتیدا ببەستێتەوە بەدروشمێک لە دروشمە هاودەمەکانی حیزب یان بە دەقێک لە دەقەکانی مارکسیزم و لینینزم، بۆیە گزیری پۆلیس زۆر بە ئاسانی و توتی ئاسا درووشم و دەقەکان دەڵێت دەڵێتەوە . هەروەک چۆن پەندێکی کۆنی مۆسۆکۆیی دەڵێت: (هەموو شتێک قەدەغەیە ئەوەش ڕێی پێدرا دەبێتە تۆپزی و زۆرە ملێ) .

بۆیە لە کاتێ ڕێگا دەدەنە گزیرێکی پۆلیس شتێک بڵێ، لێی ڕادەبینن کە دەقاودەق ئەوە بڵێ کە دروشمی هاودەم و سەپێنراوە. چونکە ئەو باش دەزانێ لادان لەزمانی (پراڤدا) مرۆڤ دەخاتە مەترسیەوە نەک بەتەنیا مەترسییە بۆ ئەوەی ئەو لادانەی لێ دەدات، بەڵکو بۆ ئەوانەش مەترسیە کە گوێیان لێ دەبێت و لە ئاستیدا بێ دەنگ دەبن.

# ئەدیب مرۆڤەو گزیری پۆلیسیش قامچی تەمبێ کردنە

نوسەر گزیری پۆلیس دەوروژێنێ بە تەوسە ڕەخنەکانی، هەروەها زیاتر ڕقی دەبزوێنێ لە کاتی گوتنی ئەو شتانەی کە دەیەوێ بە شێوەی جۆراوجۆر بە پێچ و پەنا بیڵێ .

بۆیە نوسەر لە گۆشەی نیگای گزیری پۆلیس دا مرۆڤێکی ڕواڵەت بازو ڕوهەڵماڵراوەو بەرپرسیار نییە بەرامبەر قسەکانی .

گزیری پۆلیسیش لە وڵاتە کۆمەنیستیەکاندا (زێوانی) هەرە بەرزە. گزیر زۆر بڕوای بەوەیە کە جگە لە ڕەهبەری هەرە مەزن یارەهبەرانی مەزن دا کەس بۆی نییە ڕیزی تایبەتی و جەماوەری هەبێت لە ژیانی حیزبایەتی و گشتیدا، چونکە ڕیزو جەماوەریەتی دوو شتن تەنها حیزب مافی بنیاتنان و ڕوخاندنیان هەیە. چونکە پێویستە هەموو شتێک بڕیاری لەسەر بدرێت لە مەڵبەندە جۆربەجۆرەکانی حیزبدا .

بەڵام نووسەران بەپێی سروشتی کارەکەیان ڕیزی تایبەتی بۆ خۆیان بنیات دەنێن، جەماوەرێکی زۆریش سەرسام دەکەن بە نویسنەکانیان، دوور لە بڕیارەکانی حیزب. چونکە بەهرەی تاکە کەسی لە توانای هیچ گزیرێک دانییە دابەشی بکات و چاودێری بکات. ئالەو خاڵەوە مەترسیە بێ شومارەکان سەرهەڵدەدەن. گزیری پۆلیس داوا لە نوسەر دەکات بەشدار بێت لە خەباتی

سیاسی ڕۆژانەی حیزب. چونکە هیچ کەسێک و شتێک ناتوانێ لەدەرەوەی سیاسەتدا بمێنێتەوە بە بێ لایەنی.

بەڵام هەتا لێرەش بەربەستێکی دەربڕین لە گۆڕێدا هەیە، چونکە مەبەستی گزبییری پۆلیس لە نووسینی سیاسیدا ئەو ئەدەبەیە کە بریتیە لە چەکێکی پڕوپاگەندەی بۆ بڵاو کردنەوەی سیاسەتی ڕۆژانەی حیزب.

دەبینین گزیری پۆلیس نوسەری بەناوبانگ (دیکنز) ستایش دەکات، چونکە پەردەی لاداوە لە سەر ئەو ژیانە چەرمە سەریەو تاڵەی کەلە وڵاتەکەی بەرچاوی کەوتوە.

بەڵام تیاچوون و لەناوچون بەشی ئەو نوسەرەیە کەزات دەکات بەهەمان شت هەڵسێت لە یەکێ لە وڵاتە کۆمەنیستیەکاندا. نوسەریش زۆربەی جاران دژی گزیری پۆلیسیش دەوەستێ و هەڵی دەداتێ لەسەر نەتەوە ستەمدیدەو هەژارەکانی وڵاتە کۆمەنیزمییەکان. بەڵام هەر کە ئەو هەڵوێستەی نیشان دا یەکسەر ڕاوڕاوێنەی پێ دەکرێت، لە لایەن کاربەدەستان بە بیانوی ئەوەی کە بوختان هەڵبەستێکی نەگریسە لە دژی بنیاتنانی کۆمەنیستی. گزیری پۆلیس داوای پەیڕەوکردنێکی توندو تیژ دەکات لە نووسەران، ئەوانیش هەڵبەتە ڕقیان لە توندو وتیژییە لە پەیڕەو کردندا .

لەلای گزیری پۆلیس زۆربەی کۆمەڵایەتی گرنگترە لە تاکە کەسان و تاکایەتی. بەڵام لای نووسەران بەختیاری و خۆشگوزەرانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێوانە دەکرێ لەسەر بنچینەی خۆشگوزەرانی گەل وەکو تاک.

نووسەر دەنگی دەخاتە پاڵ دەنگی باسترناک کە دەڵێ مرۆڤ لە دایک بووە بۆ ئەوەی بژێ، نەک خۆی ئامادەبکات بۆ ژیان. گزیری پۆلیسیش باوەڕناکات کەشتێکی ڕاست و جوان هەبێت بە شێوەیەکی سەربەخۆ دوور لە ئامانجەکانی حیزب و دوور لە ناوەڕۆکی سیاسەتی حیزبدا. گزیری پۆلیس داوا لە نوسەر دەکات گیان لەبەرە مرۆییەکانیان وا بۆ دەستەمۆ بکەن بە جۆرێک نە پرسیار بکەن و نە گفتوگۆ. بەڵام نووسەر ئامانجی ئاشکراکردنی نهێنیەکانی گیان لەبەرە مرۆییەکانە.

بەو شێوەیە دەبینین کەوا نووسەرو گزیری پۆلیس هەرگیز ناتوانن بە ئاشتی و بە تەبایی بژین لە وڵاتە پۆلیسیەکاندا.

# ئەدەبی سۆڤیەتی

ژمارەی پێوانی تۆماردەکات لەو بەرهەمانەی کە لە ئەنجامی ترسەوە دێنە کایەوە

## قۆناغەکانی ئەدەبی سۆڤیەتی

دەتوانین ئەدەبی سۆڤیەتی لە سەرەتای شۆڕشەوە دابەش بکەین بۆ چوار بەشی سەرەکی: بەشی یەکەم لە ساڵی (١٩١٧ تاکو١٩٣٠) دەگرێتەوە. لەو ماوەیەدا نووسەر کەمێک سەربەستی پێدرا، بۆ ئەنجامدانی ئەزموون و داهێنانی ئەدەبی .

لەدەورانی ١٩٣٠ زەبری کوشندەی سەردەمی ستالینی زۆر بەتوندی بەر پیاوانی ئەدەب کەوت. ئەوەش سەرەتای ماوەی دووەم بوو، ماوەی دیکتاتۆریەتی ستالین هەتا ساڵی ١٩٥٣ کە دەرگای کردەوە لەسەرماوە کورتەکەی سێیەم، کە پێی دەڵێن ماوەی (واڵابوون)، لەکاتێکدا ماوەی ١٩٥٨-١٩٥٩ خۆی دەنواند وەکو دەرگا واڵاکردن لەسەر قۆناغێکی توندڕەو بەرەو دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری خرۆشۆف.

ماوەی دووەم کە بۆ ماوەی دوو پشت و دوو نەوەی لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتی خایاند ، ئەو ماوەیە بە ناهەموارترین سەردەمی ئەدەبی سۆڤیەتی دژمێردرێت. ئاشکراشە کە نایابترین بەرهەمی ئەدەبی سۆڤیەتی لە دوو ماوەی یەکەم و سێیەم دا

بەچاپ گەیەنرا، چونکە سەربەستیەکی رێژەیی لەو دوو ماوەیە هەبوو ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ماوەکانی تردا .

لەو ماوانەدا، ماوەی کورت و درێژ لە بەبەست کردن و واڵاکردن لە ئاڵو گۆڕدابوون بەپێی بارودۆخی سیاسی. هەڵبەتە رژێمی سۆڤیەتیش نموونەی حوکمی سەپێنراوە بوو بەسەر هەموو ئەو وڵاتانەی کە لەژێر چەپۆکی فەرمانڕەوای کۆمەنیسیدا دەژیان.

ئەدیبانی ئەم وڵاتانەش لە هەمان بۆتەی ئەزموونی ئاوەڵە ڕوسیەکانیان تاقی کرانەوە، بەڵام لەگەڵ یەک جیاوازی، ئەویش ئەوەیە کە ئەزمونی چوار نەوەی سۆڤیەتی سەپێنرایە سەر یەک نەوە بە هەموو تاڵی و سوێریەکانیەوە، بۆیە دەبینین کاردانەوەی ئەو وڵاتانە خێراترو تونتر بوو.

لەسەرەتای شۆڕشدا زۆر لە ئەدیبە ڕوسیەکان کۆمەنیستی دڵسۆز بوون، کە ئێمە ئەمڕۆ ناویان دەبەین بە کۆمەنیستە ئەندێشەییەکان یان خولیامەندەکان (هواە) یا باشتر ووردتر وەسفیان دەکەین بە (هاوڕێیانی ناو حیزب) ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت نووسەر وەکو سەربازێکە لە (بەرەی ئەدەب)دا دەجەنگێت لە پێناو سەرکەوتنی کۆمۆنیزم لە جیهاندا، پێشوازیەکی گەرمی لێکرا لەلایەن نووسەرانی چەپڕەو. لەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی بەلشەڤ زۆربەی زۆری ئەو نووسەرانەی کە لەدوایدا لە سێدارە دران یان

ناچارکران دەمیان داخەن یان ناچار کران خۆکوژی بکەن، زۆربەیان (سەرەتای لیلیڤیتش) یان قەبوڵ کرد کە دەڵێت: "ئامانجی سەرەکی ئەدەب و هونەر بریتییە لە درم کردنی خوێنەر بە میکرۆبی (ئایدیۆلۆژیای) چینی فەرمانڕەوا، واتە ئایدیۆلۆژیەتی مارکسییە بەلشەفیەکان "لەدوایدا لیلیڤیتش لەسێدارەدرا بە تاوانی لادان."

لەو سەردەمەدا حیزبی بەلشەڤی تاقە پاوانکارێک نەبوو وەکو سەردەمی ستالین. بەڵکو هێشتا ماوەی پێڕو گرۆهەکانی تر تاڕادەیەک هەبوون، بۆیە چەند تەوژمێکی ئەدەبی جۆراوجۆر هەبوون لە ناو حیزب و لە دەوروبەری حیزبدا، کە هەڵوێستی خۆیان دەربارەی خەباتکردن دەربڕی، ویستیان دیکتاتۆریەتی ڕۆشنبیری پرۆلیتاری دروست بکەن.

هەر وەکو ئەڤرباخ گوتی: "پاش ئەوەی دەسەڵاتی سیاسیمان وەگیرکەوت، پێویستە لە مەیدانی ڕۆشنبیریش سەرکەوین و فەرمانڕەوایی بکەین".

**دەبێ حیزب ئەدەب بخاتە ژێر چەپۆکی خۆی بەبێ دڵ لە دڵ دان**

لەو بارە ناهەموارەو شڵەژاوەدا زۆر لە شاعیرانی (هاوچەرخ)و نووسەرە سیمبۆلیستەکان هەستیان کرد، کە شوێنی ڕاستە قینەیان لە یەکێک لەو دەستەو تاقمە نووسەرە کۆشکەرانەیە. ئەو دەستەو تاقمانەش یا (کۆمەڵانی نووسەرانی پرۆلیتاریان) یا ئەو تاقمانەن کە ناوەکانیان بەڵگەن لەسەر گیانی شۆڕشگێڕی ورتێکۆشەریان .

یەکێک لەو تاقمانە دەیگووت دەبێ حیزب دەست بەسەر ئەدەبدا بگرێ بەبێ سێ و دوو. لە مۆسکۆش ئەو ئەدیبانەی کەپشتاو پشت دەگەڕانەوە سەر چینی پرۆلیتاریا ناویان لە کۆمەڵەکەیان نابوو (کورە) ((کورەی ئاسنگەر)) ئەوانە جارپانداو گوتیان ئەدەبی پرۆلیتاری ئەو ئەدەبەیە کە کەسێتی چینی پرۆلیتاریای تێدا ڕەنگ بداتەوە. هەروەها دەستەیەکی تریش هەبوون بەناوی (کۆمەڵی تشرینی یەکەم) کە ئیفرباخ و کیرنسکی و گەلێک کۆمەڵەی ناوچە گەورەکانیش سەر بەو کۆمەڵەیە بوون. هەروەها شاعیرانی (ئایندەش) خۆیان بەگەر شۆڕشداو لەدوایشدا (بەرەی چەپرەوی نووسەران)یان پێک هێنا. سەر کاروانی ئەو بەرەیەش شاعیری بەناوبانگ ڤلادیمێر مایکۆفسکی بوو، ئەو مایکۆفسکیەی کەدروشمی (دوا ڕۆژ لە خزمەت شۆڕشدایە)ی

داهێنا. لە ساڵی ١٩١٨ چەند دێرێکی نووسی لەژێر ناونیشانی (مەرسومێک بۆلەشکری هونەر) کە تێیدا دەڵێ:

**تەنیا ئەوانە کۆمەنیستی ڕاستگۆن:**

**کە پردی پەشیمانی دەروخێنن**

**ئاییندەییەکان!**

**بابەس بێ هەنگاو سستی**

**بەرەو ئایندە ڕۆکێت ئاسا ڕێکەون!**

زۆربەی کۆمەڵە ئەدەبییەکان ئۆرگانی وەرزیانەی تایبەتی خۆیان هەبوو، هەروەها لە هەموو دەزگا چاپەمەنیەکان نوێنەری خۆیان هەبوو. پەیوەندیان ڕاستەو خۆبوو بە حیزب و نوسینگە دەوڵەتییەکان کە زۆر لە فەرمانبەرانیان ئەندامانی ئەو کۆمەڵە ئەدەبیانە بوون.

گرنگترین فەرمانگەی حکومەت لەنەزەری ئەدیبانەوە تا ئێستا (فلاڤالیت) بوو، واتا کارگێڕی سەرەکی کاروباری ئەدەب، کە لێپرسراوی چاودێری و بڵاوکردنەوەبوو. ئەو فەرمانگەیەش ڕاستەوخۆ لە ژێر ڕکێفی (ئیجیتروب) دابوو.

یەکێک لە هەرە گرنگترین خاڵ، کە شۆڕش لە ڕژێمی نوێدا ڕەچاوی کردبوو، ئەوە بوو کە ئەدیبان تا ڕادەیەکی زۆر پشت بە گزیرە سیاسیەکان ببەستن، یا ڕاستر بڵێین بە گزیرانی پۆلیس، چونکە گزیرانی پۆلیس تەنها فەرمانبەرێک بوون لە دەزگای پۆلیسی نهێنیدا.

بەر لە جێگیر بوونی دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری، ئەدیبان هەوڵیاندا کەوا لە گزیرانی پۆلیس بگەیەنن کەوا دەتوانن خزمەتی چاکتر بە پارت و شۆڕش بگەیەنن بەبێ هاریکاری ئەوان، گزیرانی پۆلیسیش بەشێوەیەکی گشتی لەو ماوەیەدا هەوڵیان نەدا دەست بخەنە شێوازکاری مادامەکێ نێوەڕۆکی ئەدەبی بۆنی دوژمنایەتی کردنی لێ نەدەهات.

لە ڕاستیدا ئەو کۆمەڵە ئەدەبیانەی کە لە نێوان خۆیاندا لە پێشبڕکێ دابوون، ئەو پێش برکێکردنە لە گزیرانی پۆلیس سامناکتر بوو، بە تایبەتی ئەگەر کۆمەڵێک پەیوەندیەکی باشترو لەبارتری هەبوایە بە پۆلیسی سۆڤیەتی، کە ئەوەش دەبووە نوشوستی حەتمی بۆ کۆمەڵەکەی تر.

## وەڵامی کێشەکانی کاروباری ئەدەب و هونەر لەلایەن مارکسیزم دەست دەکەوێت

ئەو کاتە بەرەی ئەدەب شلەژابوو، چونکە هەندێ لە ناوداران کە لەسەرەتادا باوەشیان بۆ شۆڕش کردەوە، ئێستا هەڵگەڕاونەتەوە دژی هەندێک لە ئەنجامە ڕاستەوخۆکانی وەک (یەسانین)ی شاعیر. بە نیسبەت (یووری ئولیشاوە) کە شۆڕشگێڕێکی بڕواپتەو بوو، سوور بوو لەسەر دەست گرتن بە بیروباوەڕەکەی لەبارەی بەردەوام بوونی کێشەی نێوان تاکایەتی و کۆمەڵایەتی. (ڕ.بابل) یش بەردەوام بوو لەسەر نووسین دەربارەی ماوەی شەڕی ناوخۆ لە جیاتی نووسین دەربارەی بابەتی پێشکەوتنی پیشەسازیدا. بلۆک و مایکۆفسکیش هەرچەندە باوەشیان بۆ شۆڕش کردەوە، بەڵام شێواز بلّح و هەرتوقی (هرطقة) بوون ( واتا لە بنچینەکانی مارکسیزم لایاندابوو) گیرو گرفتی هەرە گەورە ئەوە بوو، کە کەس نەیدەتوانی بڵێ کێ زەندیقەو کێ زەندیق نییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە مارکسیزم چڵە پۆپەی زانستەکان بوو، خاوکەرەوەی هەموو گرێ پوچکەو کوێرەکان بوو، بە هیچ شێوەیەک گومانی لێنەدەکرا، کە توانای وەڵامدانەوەی ڕاستی نەبێت بۆ هەموو پرسیارێک و مەسەلەیەک بەڵام بەتەواوی دەستەوسان بوو لەبەردەم دۆزینەوەی وەڵامی دڵخۆشکەرو ڕازیکەرو دڵنیاکەر لەسەر گیروگرفتەکانی ئەدەب.

دوایی بەدیار کەوت کە ئەو شتەی پێیان دەوت (زیباسازی) (الجماليات) مارکسی، ناوی لە تورەکەی تەریشدا نییە.

حیزب یان کەمتر بڵێین هەندێک لە ڕابەرانی حیزب بەدرێژایی چەندەها ساڵ تاقی کردنەوەیان ئەنجامدا لە پێناوی بنیاتنانی رۆشنبیری پرۆلیتاری. دەبوایەش تاقیکردنەوەکان دەست پێبکەن بە فێرکردنی کرێکاران لەسەرچۆنیەتی نووسینی (ناویان) چونکە داخوازی یەکەمی نووسینی کۆمەنیستی و بنیاتنانی ئەدەبی پرۆلیتاری ئەوەبوو کە دەبوایە ئەو نووسینە لە ڕەگ و ڕیشەوە کرێکاری بێت چ لەلایەن نووسەرەوە، چ لەلایەن نووسین و ناوەرۆکەوە، هەرچەندە ئەو ئەزموونە هەرەسی هێنا، بەڵام ئەو بیرۆکەیە هەر مایەوە کە دەڵێت لەمەودوا نابێت هونەرمەندان و نوسەران (زانایان) لە خێزانێکی سەر بەچینێکی غەیری چینی کرێکار سەرهەڵدەن.

دوایی وایان بە چاک زانی بێنە سەر بڕیاردان لەسەر یەکگرتنی نووسەرە پرۆلیتاری و ناپرۆلیتاریەکان لە بەرەیەکی گەورەدا، هەروەها لەسەریانە کە بەڵێن بدەن لەسەر لایەنگیری کردنی دەسەڵاتداریەتی سۆڤیەتی و کۆشش بکەن لە پێناو بنیاتنانی سۆشیالیزمی، بەڵام ستالین هێشتا واتا لە نێوەڕاستی ساڵانی سییەکاندا حیزبی نەکردبووە ئامرازێکی ڕووتی تۆقاندن. هەندێ لە شاعیران هێشتا گیانی حەماسەتیان تێدا مابوو.

مایکۆفسکی لە ساڵی ١٩٢٦ نووسی: "دەمەوی پێنووس و سەربەستی لە یەک ئاستدا دابنرێن، داوا لە ستالین دەکەم، بەناوی پۆلیتیبیرو کە ڕاپۆرتەکانی پێشکەش بکات لەبارەی بەرهەم هێنانی شیعر شانبەشانی ئەو ڕاپۆرتانەی کە دەربارەی ئاسن و پۆڵا پێشکەشی دەکات".

## شەڕی چینایەتی لە بەرەی ئەدەبدا

هێشتا پڕۆژەی پێنج ساڵەی یەکەم لە قۆناغی ئامادەکردن دابوو، کە بەپەلە پروزکێ دروشمانێک سەریان هەڵدا کە دەیان گوت: "پێویستە گەل بەچەکی بیروباوەڕ چەکدار بکرێت بۆ وەدی هێنانی پڕۆژەکانی بەسەروزیادەوە".

لەسەرەتای دەست پێکردنی پڕۆژەکە لە ساڵی ١٩٢٨، (کۆمەڵەی ئەدەبیاتی پڕۆلیتاری روسی) سەری هەڵدا وەک یەکێک لە بەهێزترین کۆمەڵەی ئەدیبان و نووسەران، چونکە ڕاستەوخۆ پاڵپشتی لێدەکرا لەلایەن حیزبەوە، سەرکردەکانی ئەو کۆمەڵەیە بریتی بوون لە (ئیفرباخ ، ڤادێڤ و بانفیورۆڤ) کە چەند ساڵ بوو خەباتێکی ئەدەبیانەیان دەکرد لە دژی (شێوازی بێڕەحمانەی درۆو بوختان هەڵبەستی). دەستەی ناوبراو لەساڵی ١٩٢٥ توانیان چەندەها کۆمەڵەو تاقم لە ئەدیبان و نووسەران دەم کوت بکەن، چەندەها بڵاوکراوەی مانگانەو وەرزیانەیان لە دەرچون وەستاند، چەندین ڕۆمانیش لە چاپکردن قەدەغەکران، بگرە چەندەها شاعیریان پاڵپێوەنا بۆ خۆکوژی وەک یەسانین بۆ نموونە.

لە ئاخرو ئۆخرەکانی ساڵی ١٩٣٠ ستالین لە ئامادەکردنی دەزگا مەردووم کوژەکان ببۆوە، کە لەسەرەڕۆیی بیرۆکراتی خۆی دەنواند، کاروباری پاڵاوتن و لە بێژینگدان دەستی پێکرد، هەر لە سەرەتای هەڵمەتەکە هێرشیان بردە سەر (ئیفرباخ و ڤادێڤ)،

چونکە (ئەو دووانە تەنها دژی سەرەڕۆیی چەپڕەوان دەجەنگان، لە کاتێکدا لادانی ڕاستڕەوەکانیان پشت گوێ خستبوو).

بەڵام زۆری نەبرد، کرانە دوو گزیری  پۆلیس ئەدەب، دوو سەرکردەی جەنگی چینایەتی لە بەرەی ئەدەبدا. سەدەها ڕۆمان هێشتا لە ژێر چاپدابوون قەدەغەکران، نووسەرانێکی وەک فاسیفۆلود و ڕ.بابل قەدەغەکران لە چاپکردنی دوا بەرهەمەکانیان. کەڵە ڕۆمان نوسێکی وەک بۆریس بلنیاک ناچارکرا کەوا  گۆڕانکاری بخاتە ناوڕۆکی دوا ڕۆمان کە نووسیبووی، بولڤاکوڤیش بە تەواوی دەمکوتکرا. فورنایف و شۆلۆخۆفیش بە توندی هێرشیان کرایە سەر.

لە ساڵی ١٩٢٩ بلینیاک و ئەدیبی لینینگراد زمیاتین تاوانبارکران بەچالاکی تێکدەرانەو بە مەیلداری کردنی وردە بۆرژواو ترۆتسکیزم.

جا لەسۆنگەی ئەوەی کە ئەدەب بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی سیاسییە، بەسەدان نووسەر لەناوبران لە هەڵمەتی پاڵاوتن و لە بێژینگداندا کە لە ئالقەی چوارەمی ئەو سەدەیە ئەنجام درا، هەروەها زۆر لە ڕابەرەکانی شۆڕشی ئەدەبی ناو زڕکران و ئەو دانراوانەیان کە لەژێر چاپدابوون فەوتێنران، ئەوانەشی چاپکرابوون گوێزرانەوە ستۆرەکان و قفلدران .

کۆمەڵەی نووسەرە ڕوسە پرۆلیتاریەکان، کە ساڵی ١٩٣٠ هاتن، هەر بەتەواوی ژیانی ئەدەبی سۆڤیەتیان پاوان کردبوو، (ڤلادمێر) شاعیری شۆڕش تاوان بارکرا وەک تێک دەرێک کە ئەویش بووە هۆی قەدەغەکردنی دوو ڕۆمان لە ڕۆمانەکانی، لەدوایدا وەکو نووسەرانی تر ناچارکرا بە گەر (کۆمەڵەی نووسەرانی پرۆلیتاری) کەویت، لە پێناو بەرگری کردن لە خۆیدا.

بۆ یەکەم جار مایکۆفسکی لە ساڵی ١٩٣٠ هاتە کۆبوونەوەیان و گوتی:"بیروڕامان جیاوازن، چونکە ئێوە دەمناسن و منیش بە چاکی دەتان ناسم، ئەوا منیش بوومە ئەندامێکی کۆمەڵەکەتان چونکە دەزانم ئەگەر لەدەرەوەی کۆمەڵەکەتان بم ئەوا هیچم بۆ ناکرێ".

سەرکردەکانی کۆمەڵەکە بەردەوام بوون لە هێرشکردنیان بۆ سەر مایکۆفسکی بە بیانوی بایەخ نەدان بە کاروباری جەماوەر. لە ٢٥ی ئاداری هەمان ساڵ مایکۆفسکی شیعرێکی نوێی خوێندەوە لە کۆبونەوەیەکی گشتی تێیدا هاتبوو:

ئیتر بێزار بووم
لە پرۆپاگەندەو دنەدان
لە مێژە دەمەوێ
سرودی خۆشەویستیتان بۆ بچڕم
ئای لەو شیعرانە

چەند جوان و ئەفسوناوی و بەهەرمێنن؛
بەڵام من
بەسەر خۆمدا زاڵ بووم
لەژێر پێیەکانم ئەو
گەروەم پێخوست کرد
کەسرودەکانی منی دەچڕی.

لە ١٤ی نیسانی ١٩٣٠ مایکۆفسکی خۆی بەگوللە کوشت، ئەو ڕفتارەی بەتوندی ڕەخنەباران کرا، چونکە هەرگیز لەگەڵ بۆلشەڤیەتی نەدەوەشایەوە، ماوەیەک بەسەر چوو هیچ نوسراوێکی چاپ نەکراو ناویشی لە پرۆگرامی قوتابخانەکان ڕەشکرایەوە. بەڵام ئەمڕۆ سەرلەنوێ بەشاعیری شۆڕشی ناو دەبەن بۆ وەبەرهێنانی ئەو ناوبانگەی کە دەری کردبوو.

لە کۆنفرانسی حیزب لە ساڵی ١٩٣٠ بڕیاردرا کە "لەو ڕۆژگارانەی کە خەباتی چینایەتی پەرەدەسەتێنێ، هەرچاوپۆشیەک و هەر ڕێزگرتنێک بۆ جوانسازی زمانەوانی یارمەتیدانێکی ڕاستەوخۆیە بە دوژمن".

## گەورە ئەدیبان پەنا دەبەنە بەر (پاڵەوانێتی بێ دەنگ)

دوابەدوای ئەو سەردەمێک هات کە بەتەنیا ڕەخنە گرتن لەهەر نووسەرێک دەبووە هۆی زیندانکردنی، چونکە ڕەخنە گرتن لەهەر یەکێک مانای تاوانبارکردنی بەڕەسمی دەگەیاند.

هەر کاتێک نوسەرێک تاوانبار کرابا بە تاکڕەوی بورژوازی و گومانکەر لە واقیعی سۆڤیەتی ئەوا دەمێک بوو پۆلیسی ئاسایشی سۆڤیەتی ڕاپۆرتێکی گەیشتبوێ لەلایەن کۆمەڵەی ڕوسی نووسەرانی پرۆلیتاری (کە لە دوایدا بووە یەکیەتی نووسەران) هەر کە ئەو ڕاپۆرتەیان پێ دەگەیشت ئەوا کابرای ئەدیب دەبووە میوانێکی هەمیشەیی گرتوخانەی لوبیاتکا یان لە یەکێ لەو هەزارەها سەربازگە پەرتوبڵاوەی نیشتیمانی سۆشیالیستی خۆی دەدۆزیەوە.

لە ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ کۆمەڵەی نووسەری ڕوسی پرۆلیتاری لە بەیاننامەیەکدا گووتیان:

"ئێمە نووسەرو دراما نووسانی سۆڤیەتی لە ناخی دڵمانەوە سڵاو و ڕێزمان هەیە بۆ پاسەوانی ڕاستەقینەی شۆڕش کە ڕێکخراوی (غیبۆیە) داواش لە حکومەت دەکەین میدالیای لینینیان پێ ببەخشێ"

لەوانەیە وەک گاڵتە تەنزێکی قەدەر بۆ خوێنەران دیار بێت. کە زۆربەی ئەوانەی ئەو پێشنیارەیان پێشکەش کرد یا ناچارکران بێ دەنگ بن، یا لەسێدارە دران لەدوایدا. هەندێ لە گزیرانی پۆلیسی ئەدەب ترسناکی ئەو ڕفتارەیان بەدی کرد، وەک ئەلیکسەندەر فیدییێڤ، کە پێکەوە لەگەڵ لیبدنسکی نارەزاییان نیشاندا لەسەر داب و نەریتی تاوانبارکردنی نووسەر بە دوژمنی چین و فاشیزمییەت لە بەر بچوکترین هۆ، دوا جاش دورخستنەوەی لە مەیدانی ئەدەبی سۆڤیەتی و ناردنی بۆ (شوێنێکتر) بۆ هەتا هەتایە. لەو ماوەیەبوو کە ڕ.بابل دەستەواژە بەناوبانگەکەی داهێنا: "پێویستە نووسەران لەمەودوا پاڵەوانێتی بێ دەنگ نیشان بدەن".

لە ساڵی ١٩٣٤ دەسەڵات گرتنێکی تەواو بەسەرمەیدانی ئەدەب سەپاند، لەو کاتەی کە گۆنگرەی یەکەمی یەکێتی نوسەرانی سۆڤیەتی بەسترا، یەکێ لەو خاڵە بنچینەییانەی یەکێتیەکە دەڵێ: ئامانج لە یەکیەتیەکەمان بریتییە لە بەرهەم هێنانی ئەدەبێکی بەرزو لە پلەیەکی بەرزی هونەری، ئاوێتەبوو بەگیانی پاڵەوانیەتی و تێکۆشان و پرۆلیتاریای جیهانییەوە، تێکهەڵکێشراو لەگەڵ مەزنایەتی سەرکەوتنی سۆشیالیزم، ڕەنگدەرەوەی دانایی حیزبی کۆمەنیستیی بێت.

بەم پێیە بەتەواوی دەست بەسەر مەیدانی ئەدەبدا گیرا، هەروەها شێوازێکیان گرتە بەر بۆ دەست بەسەرداگرتن و

هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەدەبی لەهەر چوار گۆشەکانی جیهانی کۆمەنیستی. بە پێویستی دەزانم بە درێژی باسی ئەو شێوازە بکەین چونکە دووبارەو سێبارە بوونەوەن لە هەموو ئەو وڵاتانەی کەلە خولگەی چین وسۆڤیەتدا دەخولانەوە.

## دام و دەزگای حیزب دەستدەخاتە ئەوکی ئەدیبان

ئەو دەسەڵاتەی یەکیەتی نووسەرانی سۆڤیەت (هەروەها یەکیەتیەکانی هەموو وڵاتە کۆمەنیستیەکان) بەدەستیانەوە بوو، زۆر زیاتر بوو لە دەسەڵاتی هەر یەکیەتیەکی کرێکاری لە گشت جیهاندا، هیچ ئەدیبێکی چالاک نەیدەتوانی لەدەرەوەی ئەو یەکیەتیە ژیانی ئەدەبی خۆی بەسەر بەرێت، چونکە هەموو ڕۆژنامە ئەدەبی و ڕەسمیە سۆڤیەتییەکان سەر بەدام و دەزگای دەوڵەت بوون یان ڕاستەوخۆ لەژێر ڕکێفی دەوڵەتدا بوون.

هەروەها هەموو دەستە نووسەرەکانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ملکەچی بڕیارەکانی یەکیەتی نووسەران بوون، ئەویش بەش بەحاڵی خۆی مل کەچی ویست و خواستەکانی لێژنەی ناوەندی بوو، بۆیە ئەوەی ئەندامی یەکیەتی نەبووایە بۆی نەبوو بەرهەمەکانی چاپ بکرێ. ئەو ئەندامانەشی دەرکرابوون ئەوا بێگومان قەدەغەدەکران لە چاپکردنی بەرهەمەکانیان، هەتا جارێ پەشیمان بوونەوەیان نەدابا یان تارێزیان بۆ نەگەڕابایەوە.

یەکیەتی نووسەران بەخشرابوون لە هەموو جۆرە باج و میرانەیەکی ناوخۆو حکومی، لەهەمان کاتدا (سندوقی ئەدەبی یەکیەتی سۆڤیەت) لە ژێر باڵی خۆیان بوو، ئەو سندوقەی کە

ڕێژەی (١٠%)ی ئەو پارەیەی وەردەگرت کەدەدرایە ئەو نووسەرانەی کەلە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان شتیان بڵاو دەکردەوە.

ئەو سندوقە سەرپەرشتی دەکرد لەسەر کاگێڕی خانووەکانی حەسانەوەو ڕابواردن و چێشتخانەکان و دایانگەی منداڵەکانیان. هەروەها ماوەی پشودانی بۆ نووسەران دیاری دەکردو کۆمەکی پارەو پولی ئەو ئەدیبانەی دەکرد کە سەرگەرمی دانانی بەرهەمی نوێی قەبارە گەورە بوون. کەواتە یەکێتی نووسەران و سندوقی ئەدەب وەکو شادەماری خوێنی ژیانی مادی نووسەران بوون.

دەرکردنیش لە یەکیەتی واتا سڕینەوەی سیفەتی (نوسەر) لەبەردەم وشەی (پیشە) لە ناسنامەی نووسەران دا. کە نوسەریش دەردەکرا یان ناچار بوو بگەڕێ بەدوای کارێکی ترو لە بوارێکی تر (ئەوەش کارێکی گرانە بۆ ئەو و هاووێنانی ئەو) یان لە ڕیزی بێ پیشەیی و بێکاران پۆلێن دەکرا، دەکەوتە ڕێزی بێکارو بێ جێ، کە مافی خانوداری لە دەست دەدا لەو شارەی کە تێیدا دەژی.

جا لەبەر ئەوەی گەلێک جاران ئەوانەی لە یەکیەتیدا کاردەکەن، هەر ئەو کەسانەن کەسەرپەرشتی سندوقی ئەدەبیان بەدەستە، هەڵبەتە پەیوەندیەکی توندو پتەویان هەیە بە دەزگای حیزبەوە. ئەو دەزگایەش کە بەرپرسیارە لە هەر دووکیان بەشی ڕۆشنبیری و زانستە لە لێژنەی ناوەندی، کە ئەویش بەدەوری خۆی

بەرپرسیارە بەرامبەر سکرتاریەتی حیزب لە بارەی هەموو کاروبارەکانی ئەدەب دا.

یەکێتی نوسەرانیش لەلایەنی ئایدیۆلۆژیەوە بەستراونەتەوە بە بەرژەوەندێتی پرۆپاگەندەو دنەدان.

بەو شێوەیە دەبینین دەزگای ڕەسمی دەستی خستۆتە ئەوکی نوسەر، بۆیە دەبێ هەموو بەرهەم و نوسراوەکانی جیهانی کۆمەنیستی لەبەر ڕۆشنای ئەو ڕاستیەدا بخوێندرێتەوە.

# ئەدیبان بوونەتە مایەی ڕق و قینی خوێنەران

لە یەکەم کۆنگرەی یەکیەتی نووسەران، ستالین ئەدیبانی وەسف کردوە، وەک ئەندازیارێک کە بنیاتنانی گیانی مرۆڤایەتی ئاراستە دەکەن. جیدانۆڤ گوتی، ئەندازیارانی گیانی مرۆڤایەتی دەتوانن بیرو هۆشی خوێنەرگۆش بکەن و گیانی سۆشیالیزمی تێدا بچێنن لە ڕێگای ڕیالیزمی سۆشیالیزمیدا. هەروەها گوتی:"ئەدەبی سۆڤیەتیمان لەوە ناترسێ تاوەنبار بکرێت بەلایەنگیری، بەڵێ، لایەنگیرە. چونکە لەسەردەمی خەباتی چینایەتی دا ناشێ ئەدیبێکی ناسیاسی و چین نەناس و بێ لایەن هەبێت".

لەهەمان کۆنگرەدا کارل رادیک گوتی :"ئەگەر دەستبەرداربوون لە ڕایەکی تایبەتی گران بوو لای نوسەرێک، پێویستە لەسەری ئەزموونەکانی شۆرشی سۆڤیەتی بە وردی بخوێنێتەوە، ئەوکاتە بۆی ڕوون و ئاشکرا دەبێت کەئەوەی بیەوێ خەبات بکات لەدژی ئیمپریالیزم، دەبێت لەڕیزی جەماوەردا ڕێ بکات. بەڵام ئەگەر بەناوی ڕای تایبەتی دژی جەماوەر وەستا، ئەوکاتە بەدەر دەکەوێ کەئەو ڕایانە ڕای تایبەتی خۆی نین، بەڵکو ڕای کۆمەڵانێکی بورژوازی و دژ بە پرۆلیتاریان".

هێندەی نەبرد رادیک بە دە ساڵ زیندانی حوکم کرا وەک دوژمنێکی پرۆلیتاریا. ئەو کاتە ئەدیبانی سۆڤیەت گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە هەرچی زووە خۆیان دەرباز بکەن لە بیرو ڕایە

تایبەتیەکان، چونکە شێوازی تاکایەتی و تایبەتی بەرە بەرە بووە شتێکی ترسناک و سامناک.

بۆیە لە ڕۆمان نووسان قەدەغەکرا وەسفی فەرمانبەرانی حیزب و کرێکاران و جوتیاران بکەن بەواقیعی، بەڵکو دەبوایە بەپێی ویستی حیزب باسیان بکەن. بۆیە دەبوایە (پاڵەوانی ئیجابی) لە هەموو چیرۆک و ڕۆمان و درامایەک کۆمەنیستێکی تەواوی بێ عەیب بێت، لە لایەکیترەوە ( پاڵەوانی سەلبی) کورتەی هەموو تاوان و خراپەکارییەکی بورژوازی بێت.

نالەبارترین سەردەم کە ئەدیبان بەخۆیانەوە دیت، سەردەمی پاکسازی جوتیاران و پاکسازیە مەزنەکان بوو، کە ستالین ئەنجامی دا، لەو سەردەمەدا ئەدیبان بۆ نزمترین پلەی مرۆڤایەتی دابەزین لە نیگای گەلانی سۆڤیەتدا، زۆریان ببوونە مایەی ڕقلێبوونەوەی خەڵک.

بەپێی ئارەزووی ستالین لەکاتی هەوڵدانی بۆ بە زەبرو زەنگ سەپاندنی رژێمی کێڵگە گشتیەکان، نزیکەی دە ملیۆن جوتیار لەناو بران هەزارەهاشیان دوور خرانەوە بۆ سەربازگاکانی کارە زۆرە ملێ و بێگارەکان.

ئەو فەرمانەی کە ستالین و مولوتوف لە ٩ی ئایاری ساڵی ١٩٣٣ دەریان کرد سەبارەت بە دەستگیرکردنی جووتیارە

دەوڵەمەندەکان (کۆلاک) ئەو چەشنە جووتیارانەی دیاری کرد بۆ گرتن و دورخستنەوەی خۆیان و خێزانیان.

بەو شێوەیە ملیۆنەها جوتیار لە سێدارە دران کە بووە هۆی پڕبوونی ڕێگاو بان و شارودەرەکان بەو هەتیوانەی کە سەرگەردان و ئاوارە بوون.

ڕژێمی پۆلیسی نهێنیش باڵی کێشا بەسەر کێڵگە گشتیە نوێیەکان. جوتیاران دەردەسەریان کێشا بەدەست هەژاری و ترس و لەرز، لە هەموو ناوچەکان هەزارەها کۆمەنیست گیران بەتاوانی هاوسۆزیان لەگەڵ جوتیاران، ئەو کۆمەنیستانە ڕەوانە کرابوون بۆ لادێیەکان بۆ سەپاندنی سیستمی کێڵگە گشتییەکان، بەڵام ئەو تاوانانەی کە پێیان سپێردرابوو نەیان دەکرد، شارەکان پڕ ببوون لە جوتیارە هەڵاتووەکانی کێڵگەکان. لەسەر شەقامەکان بڵاو ببونەوە لاکەیان دەهات لەبرسان و دەرۆزەیان دەکرد. ملیۆنەها کرێکارو جوتیار دەکوژران و برسی دەکران لەکاتێکدا ئەدیبان باسی بەختیاری سۆشیالیستیان دەکرد.

هەر لەخودی ئەو ماوەیەدا سەدەها ڕۆمان چاپکران لە ستایش کردنی خەبات لە پێناوی جێبەجێ کردنی کێڵگە گشتییەکان، هەر ڕۆمانێکیش باسی گوندێکی کراوی دیاری دەکرد کەوا چۆن بەربەرەکانی دروست دەبوو لە نێوان جوتیارە کۆنە پەرستەکان کە

دەست بەرداری کێڵگەکانیان نەدەبوون و، لە نێوان جوتیارە (پێشکەوتو خوازەکان) کە چووبوونە ڕیزی حیزب و ئارەزوی جێبەجێ کردنی کشتوکاڵی بە کۆمەڵیان دەکرد. پاش ئەوەی کێڵگەکە دروست دەکرا بە (قایل بوون) چەند گیروگرفتێک دەهاتە پێشەوە. وەک بێ بارانی و لافاو ووشکی کەهەڕەشەیان لەبەرهەم دەکرد، هەروەها خۆدزینەوەو کردەوەی تێکدەرانە دەبوونە هۆی زیان گەیاندن. لە کۆتایی ڕۆمانەکە، لە ژێر سەرکردایەتی (پاڵەوانی ئیجابی)، جوتیارێکی ( پێشکەوتوخواز) یان سەرۆکی کێڵگەی گشتی، یان زۆر جار سکرتێری حیزب بەدیاردەکەوتن و خەباتەکەیان بەسەرکەوتنێکی مەزن کۆتایی پێدەهێنا هەر یەکسەر پاش ئەو خەباتە خێرو خۆشی بەسەر کێڵگەکە دەبارین. ئینجا پیاوانی پۆلیسی نهێنی هەردەم ئامادە دەبوون دەست وپێی (کاوڵکەرە هیچ و پوچەکان و دوژمنە چەپەڵەکانی گەڵ) کۆت و زنجیر بکەن. ئەم بابەتانە، لەگەڵ چەند گۆڕانێکی ناوخۆیی و کەم، جەمسەرو تەوەرەی هەموو چیرۆکەکانی ئەو سەردەمە بوون، ئەو رۆژگارە جەماوەر بێنرخی و مایە پوچی دانەرو ئەدیبانیان بۆ بەدیار کەوت. چونکە کەس نەبوو ئاگای لە قەسابخانە گشتیەکان و شێوازە تۆقێنەرەکان و داپلۆسێنەرەکان نەبووبێ، کە گرتیانە بەر بۆ جێبەجێکردنی ڕژێمی کێڵگە گشتیەکان، لە لایەکی ترەوە هەروەک ئەوەی جەماوەر لە گوێی گادا نووستبێ ئەدیبان و نووسەران بەردەوام بوون لەسەر

نووسینی ئەو ڕۆمانانەی کە باسی بەهەشتی خەیاڵی جوتیاران و پاسەوان و پارێزەرانیان دەکرد لە پیاوانی پۆلیسی نهێنی.

بەو شێوەیە سەندیکاکانی کرێکاران لە گشت کارگەکانی یەکێتی سۆڤیەت بوونە ئامێرێکی یاریدەدەرو داردەستەی پۆلیسی نهێنی، ئینجا کاتژمێرەکانی کارکردنیان زیاد کرد، مووچەی ڕاستی کەم کرایەوە، بارو گوزەرانیش بەتەواوی شلەژا.

لەگەڵ ئەو بارە نالەبارەشدا هێشتا رۆمان نووسان زیاتر زیادەڕۆییان دەکرد لە باسکردنی ئەو نازو نیعمەتەی کە کرێکاران تێیدا دەژیان. هەروەها باسی ئەو سەرکەوتنانەیان دەکرد کە بەدەستیان هێنا لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرانەی کە لە پێشیان بوون.

بەڕاستی ئەو ڕۆمان و دراماو کورتە چیرۆک و شیعرو سرودانەی کە هەڵبەستران بۆ ستایشکردن و بەشانوباڵا هەڵگوتنی ستالین و داروودەستەکەی. هۆی سەرەکی بوون لە دوورکەوتنەوە و پشت لێکردنی جەماوەر لە ئەدەبی هاوچەرخی سۆڤیەتی.

شتێکی ئاشکراشە کەوا بەرهەمی ئەدەبی ئەو سەردەمە بەپێی پلانێکی نەخشە بۆ کێشراو ئاراستە دەکرا، کاتێک دەیانەویست دەزگایەکی پیشەسازی یان شتێکی لەو بابەتانە دروست بکەن، لەشکرێک لەنوسەران ڕەوانە دەکرانە مەیدانی کارکردن لەوێ

دەمانەوە هەنگاو بەهەنگاو باسی ئەنجامدانی کارەکەیان دەکردو ڕۆڵی نەمرانەی ستالینیان لە پرۆژەکە بەدیار دەخست، ئەو ستالینەی کە هەموو گیرو گرفتێکی چارەسەردەکرد، بە ئامادەبوونی یان تەنها بە ناردنی وشەیەک و ئامۆژگاریەک. کەسێکیش ڕزگاری نەبوو لە نوسینی ئەو جۆرە بەرهەمە بێ نرخانە تەنها دوو تاقم نەبێ: یەکەمیان تەشریفیان لە زیندانەکان بوون دووەمیان پەنایان بردبوە بەر (پاڵەوانێتی بێ دەنگ) هەندێک لەنووسەرە ناودارەکان توانیان ئەو درۆیانەی کە لەناو نووسینەکانیان دا هەبوو زۆر زەق و ئاشکرا نیشانی نەدەن و کەمتر ببێتە هۆی و روژاندنی بێزاری خەڵک، بەڵام هەتا ئەوانەش لە دوایی دا چەندین درۆو دەلەسەیەکی ئابڕوتکاویان خزاندە ناو نووسینەکانیان.

# دیکتاتۆری ئەدەبی ڕوسی

لە ساڵی ١٩٣٦، کە پاکسازی مەزن دەست پێکرا، ئەوکاتە ڤادێڤ سەرۆک و سکرتێری گشتی یەکێتی نووسەران بوو، لەو پایەی مایەوە هەتا ساڵی ١٩٤٤، ئینجا دیسان هاتەوە سەر پلەو پایەکەی لە ساڵانی نێوان (١٩٤٦-١٩٥٤) زۆربەی زۆری ئەو ماوەیە سەرۆک و سکرتێری لێژنەی ئەدەبیاتی حیزب و سەرۆکی لێژنەی خەڵاتی ستالین بوو. بە واتایەکی تر، دیکتاتۆری ئەدەبی سۆڤیەتی بوو. جیهانی ئازادیش لەو ڕۆژە ناسیان کە ڕەفتارە سەیرو سەمەرەکەی نیشان دا لەکۆنگرەی ئاشتی نێو دەوڵەتی لەساڵی ١٩٤٨، کاتی هێرشە دڕندانەکەی کردە سەر ئەدەبی ڕۆژئاوایی و باسی شکستی و هەرەسهێنانی ئەدەب و خۆرئاوابوونی ڕۆشەنبیرە بەریتانیەکانی کرد، دەربارەی ئەدەب و ڕۆشنبیری ئەمریکاش گوتی بۆنی لەناوچوون و بۆگەن بوونی لێدێت.

لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە گوتی: "ئەگەر کەمتیاران بیان توانیبایە لەسەر ئامێری چاپکردن کار بکەن، یا ڕێویەکان قەڵەم پاندانیان بەکارهێنایە دەیان توانی ئەو بەرهەمانە بنووسن کە ت.س. ئەلیوت و یوجین ئونێل و دوسی باسوسی و جان بۆلڕ سارتر و ئەندرێ مارلو دەینووسن". ئەو تەرزە پیاوە بە درێژایی ١٤ ساڵ دیکاتۆری ئەدەبی سۆڤیەتی بوو.

هێشتا ناتوانین بەیان و بڕیاری کۆتایی بدەین دەربارەی ئەدەبی سۆڤیەتی لە سەردەمی ستالین دا. بەڵام جیهانی دەرەوە ئاگادارە لەو کۆمەڵە ڕۆمانەی کە بەزمانی (پراڤدا) نوسراون تا بڵێی مەلول و بێزارکەرن. کە خوێنەری ڕوسی ناچارکرد بگەڕێتەوە ڕابردوو بەرەو ئەو ئەدەبە باڵایەی کە لەسەدەی نۆزدەم دا گۆڕەپانی ئەدەبی ڕوسی جۆشدا بوو. لە ڕاستیدا ژمارەی ئەو دانراوو ڕۆمانە بەنرخانە نازانین کە لەو کاتەدا قەدەغەکران. بەڵام بەڵگەنامەکانی حیزبی سۆڤیەتی و هەروەها دەستهاویژی نووسەرە سۆڤیەتیەکانی پاش سەردەمی ستالین، پەنجە بۆ سەدەها نموونە درێژ دەکەن.

بەڵام ڕووەکەی تری بەیانی کۆتای ئاماژەی دەکرد بە ڕوداوەکانی خۆکوژی و گرتن و کوشتن و لەسێدارەدانی ئەدیب و نوسەران چونکە باسی ڕێزگەڕاندنەوەی دەکرد بۆ کۆمەڵە ئەدیبێکی وەک کرشون و بسینسکی و کوسلتۆف ترياکۆف و چەندانی تر .

هەندێکی تر لەپاش بەسەرچوونی ١٧ ساڵ لە سیاچاڵەکانی ئازادکران. بەڵام ڕ.بابل و کەسانێکی زۆری تر هەر لە گرتووخانەکان سەریان نایەوە. هەر لەو ماوەیە زانرا کەوا بۆریس بلنیاک گوللەباران کراوە، بەڵام تێکڕای جیهان نازانێ کام جۆرە مردن سەپێنراوەتە سەر دراما نووسانی وەک ئەراکادین و ئوروغلو بالی لیادوف و میرهۆلد و رافالسکی و ناتالی سارلز، ئەوەش تەنها

باسی ئەدیبە ناودارەکان بوو، چونکە ناتوانین باسی هەموو هاوچارەنوسانی تر لە ئەدیبە بچوکەکان بکەین.

بەگوێرەی گۆرگێ تائێستاش ئەدیبانی ڕوسی دەڵێن ژەهر خوارد کراوە. لە ماوەی واڵابوونیش هەرگیز باسی ڕەخنەگرانی ئەدەبی وەک ئیفرباخ و بورباتوف و لیلیفتش نەدەکرا، هەروەها هیچ دەربارەی چارەنوسی ئەو ئەدیبانە نەدەزانرا کە تاڕادەیەک لە ڕۆژئاوا ناسراوبوون لە پاش ون بوونیان. لەوانەش تاراسۆف ورودوجونۆف و ئەنتلیموک و دومانۆف ئۆسب ماندلستام و مرسکی چەندانی تر.

**بانگەوازێك بۆ ئەدیبان بۆ گەواهی هێنانەوە بە قسەی ڕاست**

بەڵام بەگوێرەی ئەدیبە ئۆکرانیەکان و ئەوانەی لەوان لەسێدارەدران و زیندانی کران ژمارەیان زۆر زۆرترە لە ژمارەی هاوەڵەکانیان لە ڕوسیا. هەروەها لیستەی خۆکوژەکان زۆر درێژترە.

چەندین نووسەریش ناچارکران لەسەر بێدەنگی بۆ چەندەها ساڵ، لەوانەش جگە لە باسترناك، ئەننائخماتۆف و زوهشنکۆ و سیبیلنیا و یورئۆلیشا.

لەساڵی ١٩٤٦ دیکتاتۆری ئەدەب فادیف وەسفی باسترناکی کرد بەوەی کەوا تاکڕەوێتیەکی سەیرو نامۆ دەنوێنێ کە دوورە لە گیانی کۆمەڵگای سۆڤیتی. جیدانوفیش وەسفی ئەننا ئیخماتوفی کردبە دزێوترین شێوە کاتێک گوتی ئەننا ئافرەتێکی سۆزانی و ڕاهیبەیە، نوێژو ئاڵودەکی تێیدا تێکەڵ بەیەک بوون. لەبارەی زۆشنکۆەش گوتی ئەو پیاوە ئابڕوبەری کۆمەڵگەی سۆڤیەتەو دوژمنێکی چەپەڵی گەلە، ئەو نووسەرانە بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ کران.

ئینجا ئەو گۆڕانکاریانە دەستیان پێکرد، کە دوایی بەماوەکانی واڵابوون ناسران هەر ڕاستەوخۆ لەپاش مردنی ستالین. هەر لەساڵی ١٩٥٣ ئەو تاوانە ئاشکراو ڕوپۆشانەی کە ئاراستەی ڕێبازی حیزب دەرکرا لە ئاراستەکردنی ئەدەبدا تا دەهات زیاترو بەهێزتر دەبوون.

ڕۆژنامەی (پرافدا) چەند وتارێکی بڵاوکردەوە تێیدا هێرشێکی توندی بردە سەر ئەو ئەدیبە شەرمنانەی کە لەجیاتی ئەوەی خۆیان تاوانبار بکەن بە شێواندنی ڕاستی و هەقیقەتی سۆڤیەتی. لە جیاتی ئەوە هەڵسان بەرەو نەقدارکردن و باقو بریق کردنی ئەو هەقیقەتە. هەروەها (پراڤدا) گلەیی و گازاندەی لە دەست بەتاڵی و بێ جەماوەری شانۆکان کرد، چونکە گەلی سۆڤیەتی بێزارو مەلول ببوو لە ژیانی بەتاڵی و بێ کێشەیی.

لە پاش ئەوە بە چەند مانگێک سالنسکی ڕۆمان نووس لە ڕۆژنامەی (لیتیراری گازیت) لە ڕێکەوتی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٣ نووسی:"ئەوەی زیاتر مایەی پەژارەو خەمانە، هەندێ لە نوسەران هێشتا خۆیان ئازاد نەکردووە لەو چاودێرە پەنهانییەی کە بۆ ماوەیەکی درێژە جێگای خۆشکردوە لە تەنیشت نووسەر و بۆتە هۆی بەستنی بیرو زمانی نووسەر".

لە ئەیلولی ١٩٥٣ فیرا ئەنبەرلەبەردەم ئاپۆرەیەک لە ڕەخنە گران گوتی:"جەماوەری سۆڤیەت تەواو بێزار بوون لە (هەڵگرتنی هەمان خاکەناس و بنیاتنانی هەمان عەمبارو قیرتاوکردنی هەمان ڕێگا".

هەروەها گلەیی کرد لەڕەخنەگرانی سۆڤیەت چونکە زات ناکەن بیروڕای کەسێتی خۆیان دەرببڕن لە جیاتی ئەوەی هەر سوڕ بخۆنەوە لە گەواهی هێنان بە دەقەکانی ئایدیۆلۆژیەتی حیزب .

## ئەدیبانی دوورو پاکانە دەکەن بۆ درۆیەکان

ئۆلگا برغفولتزی شاعیر لە ڕۆژنامەی (لیتراری گازیت) گوتی:"ژمارەیەکی زۆر لە شیعرو سرودەکانمان شتێکی گرنگیان کەمە ئەویش مرۆڤایەتی و، گیان لەبەری مرۆڤە".

کەڵە نوسەرانی سۆڤیەت بەشێوەیەکی گشتی پەردەیان لەسەر کەلاکی دزێوی ئەدەبی سەردەمی ستالین هەڵدایەوە.

کاتێک ئافرەتی بلیمەت و ڕۆمان نووس "لیدیا سیگۆلینا" مرد لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، هاوەڵەکانی بێدەنگی لیدیایان دەگەڕاندەوە بۆ سروشتی بەرهەڵسکارانەی ناوەوەی خۆی لە دژی هەموو درۆو دەلەسەیەک. ئاشکراشە کەوا لیدیا ناچرالست (سروشتی)بوو سەر بەقوتابخانەی کۆن بوو، لە ڕاستی و حەقیقەتیش بەولاوە نەیدەتوانی هیچ شتێکی تر بهێنێتە بەرهەم.

ئەهرنبێرگ گوتی :"دەستگرتنی لیدیا بەڕاستی و ڕاستگۆیی کارێکی مەزن بوو چونکە ئێمە ناتوانین لە ڕێگای ئەدەبەکەمانەوە ڕاستی بەپەرش و بڵاوی بدۆزینەوە".

ماریتا شاغریان کە وەک ئەهرنبێرگ لە ڕاستی لای دابوو هەتا لەنووسین نەوەستێ لە وتارێکیدا کە بۆ بەراورد کردنی بێدەنگی دەستە خوشکەکەی سیگۆلینا درۆو دەلەسەکانی نووسەران

نوسیبوی:" مرۆڤ بەزۆرەکی نابێتە درۆزن ئەگەر چەند درۆیەک لەدەمی هاتە دەرەوە، من باسی ئەم جۆرە درۆیە تایبەتیە دەکەم کەلە ئەنجامی دەسخەڕۆکردن دروست دەبێ بۆ ئەوەی ئەدیب خۆی لەپشتیەوە بشارێتەوەو خۆی دەرنەخات لەو قەوقەعە ناوخۆیەوە ناوەکییە، ئەو جۆرە درۆیانە درمەکەی بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئێمەی ئەدیب و نوسەرانەوە گوێزراوەتەوە. ئەو درۆیە بێگومان ڕوپۆشێکی بەرگرییە، گەندەڵی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دەسەلمێنێ، لەسەر مرۆڤیش پێویستە خۆی پێ روپۆش بکات هەتا دەبێتە بەشێک لە روخساری". لەهەڵسوکەوتی خوێنەرانی سۆڤیەت بە دیار دەکەوێت کە ئەوانیش لەوباوەڕەن کە مرۆڤ بەناچاری نابێتە درۆزن لە بەر چەند درۆیەک چونکە دەیانزانی ئەگەر نووسەر بیەوێت نوسینێکی تیِشکی خۆر ببینێت پێویستە چەند درۆیەکی زۆرە ملێیانەی تێکەڵ بکات، چونکە ئەو کارە هەلێکی باشی بۆ دەرەخسێنێ بۆ گوتنی چەند ڕاستیەک، یان لەوەش گرنگتر، چەند ڕاستیەکی گرنگ بشارێتەوە لەنێو دێرەکانیدا.

لە ڕاستیدا هەر کاتێک ڕژێمی فەرمانڕەوا سوور بوو لەسەر ماڵیکردنی ئەدەب بۆ بەرژەوەندی خۆی، یەکسەر ژمارەی ئەو خوێنەرانە زۆر دەبێت کە بەدوای قسەی ڕاستدا دەگەڕێن لە پشت دەستەواژەی درۆیە سەپێندراوەکان دا.

ئەو سەردەمە ناونرا بەناوی ڕۆمانێکی ئیلیا ئەهرنبێرگ بە ناونیشانی (توانەوەی سەهۆڵ) کە لەژمارەی مانگی ئایاری ١٩٥٤ لە گۆڤاری (زناهیا) بڵاوکرایەوە. هەوەها بەهەڵە لەڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا گوترا کەوا ئەو ڕۆمانە بوێرەی ئەهرنبێرگ یەکەم پەردە لادان بوو لەسەر هەقیقەتی جەورو ستەمی ناوەوە. ئەوەش ڕاست نییە، چونکە ئۆزبنسکایا و لیونید لیونۆف و چەندێکی تر ئەو جۆرە ڕۆمانە چاونەترس ئازادانەیان بڵاوکردبۆوە لە ساڵی ١٩٥٣. هەروەها هەندێکی تر لەو جۆرە ڕۆمانانە لە پاش مردنی ستالین نوسران، کە پڕبوون لە قسەو دەستەواژە بوێرانە هەرچەندە کەسانێک ئیدیعای ئەوە دەکەن کە لەدوایدا بۆیان زیادکراوە واتە لەسەرەتادا ئەو جۆرە دەستەواژە بوێرانەی تێدا نەبوون.

زۆر لەنوسەران نەیان دەتوانی ئەرکی چاودێری خودی ئەنجام بدەن، چونکە بەسەربەستی دەیان نووسی بێ ئەوەی بیر لە چاودێری بکەنەوە. پیلانی نووسینیان لە ئێستاو ڕابردوشدا، بریتیبوو لە لەبیرخۆبردنەوەی هەموو شتێک لەکاتی نووسیندا، هەتا هیچ شتێک نەبێتە هۆی پساندنی زنجیرەی بیرکردنەوەی. بەڵام پێش ناردنی دەست نووسەکە بۆ چاپخانە، زۆربەی دەستەواژە بوێرەکانیان لادەبرد بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی ئەوانی تر بگونجابایە.

## ترسنۆکەکان بەدەم ڕێوە دەست دەکوتن بەنێو تۆپەڵە درۆیەکاندا

لەپاش مەرگی ستالین کاتێک نووسەران چالاکیەکانیان دەست پێکردەوە، هێرشیان کردە سەر ستەمکاری، هەندێکیان هیچ شتێکیان لە نووسینەکانیان لانەدەبرد بە پێی خواست و ئارەزووی حیزب، ئەوەش نهێنی ئەو هەموو ڕۆمانە لە جۆری ڕۆمانی "ئەهرینبێرگ"ـمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە ڕاستەوخۆ لە پاش مردنی ستالین بە دیار کەوت.

لە پلەی یەکەمدا ڕۆمانەکان جەختیان کردە سەر ڕیسواکردنی کردەوەکانی داپلۆسین و گرتن و لە سێدارەدانی خەڵکانێکی بێتاوان.

لە ساڵی ١٩٥٣ ئوزنبسکایا ڕۆمانێکی بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی (هاوین مان) لەو ڕۆمانەدا پاڵەوانی ڕۆمانەکە پرۆفیسۆر لوباتین دەبێتە قۆچی قوربانی تۆقاندنی شێتانە

پاڵەوانی ڕۆمانەکە دیاردەیەکی سەیرو نامۆ بەدی دەکات لەو زانکۆیەی کە تێیدا وانە دەڵێتەوە، ئەو دیاردەیەش ئەوەیە کەهەندێک وشە مانای ڕەسەنی خۆیان ون کردووە لە جیاتی ئەوان چەند زاراوەیەکی نوێ هاتوونەتە کایەوە، بۆ نموونە ون بوونی وشەی ( بیروڕا). ئەگەر بیرکردنەوەی فلان مامۆستاو فیسار زانایە نەگونجا لەگەڵ بیرکردنەوەی بەڕێوەبەر، بەو بیرکردنەوەیە

ناڵێن (بیرورِا)یە یان رێبازە. بەڵکو پێی دەڵێن (هەڵە). رەخنەو نارەزایەکانیش پێیان ناگوترێ گۆشەنیگاو روانگە یان گفتوگۆی فیکری بەڵکو پێی دەڵێن (هەڵمەت) یان (هێرش). ئەگەر هاتوو مامۆستایەک بەبێ ئەنقەست (هەڵە)یەکی کرد، یان (هێرش)ێکی کرد، ئەوا دوا رۆژی هەر لە پێشەوە بریاردراوە. چونکە بە رای ئەوان پێویست ناکات خۆیانی پێوەماندوو بکەن و مشتومرِی لەگەڵدا بکەن یان هەوڵدەن قەناعەتی پێ بێنن کە کارەکەی هەڵەیە، بەڵکو لە جیاتی ئەوە دەست دەکەن بە سوک کردن و گاڵتە پێکردنی، ئەگەر هەر سور مایەوە لەسەر بیرورِای خۆی ئەو کاتە (تەدابیری ئیداری) توندی دەرهەق دەردەکەن.

وشەی(تەدابیری ئیداری) هەڵبەتە دەستەواژەیەکی نەرم و ناسکە ماناکەی (دەرکردنە). ئوربنسکایا لە رۆمانەکەی بەدیار دەخات کەوا چۆن ناوەرۆکی زانست لە مەترسدایە لە سۆنگەی لوتبەرزی گزیرە نەفامەکانی پۆلیس، هەروەها دەریخست کەچۆن ملهورِێتی دەستدرێژی دەکاتە سەر توانایی داهێنان و کۆششە باڵاکانی مرۆڤ.

پاڵەوانی رۆمانی (داستانی روسی) لیونید لیونوف کە ساڵی ١٩٥٣ چاپ کرا، لە هەمان بارودۆخی پرۆفیسۆر لوباتین دایە، بەڵام بە هەوڵ و کۆششی بولیای کچی رزگاری دەبێت، ئەو کچەی کە نوێنەری نەوەی نوێی سۆڤیەتیە. ئەو کچە شیرگۆش کرابوو

بەرق لێبوونەوەی سەرمایەداری و جیهانی کۆن، بەڵام بەتاسەو ئاواتەوە حەزی بە دیتنی ئەو جیهانە دەکرد لەوبارەیەوە دەڵێت:"شتێکی زۆرم لەبارەی ئەو جیهانە خوێندۆتەوە، بەڵام چەند دەکەم لە شتێک ناگەم. ئەویش ئەوەیە چەندەها سەدەیە ئەو جیهانە بەرەو تێکداشکان و هەڵوەشانەوەو هەرەسهێنان دەچێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لەسەر پێیانە. چەند بەئاواتەوەم کە تەنها چاوێکم پێی بکەوێت! چۆن دەشێت شتێکی وا بەو شێوەیە بەردەوام و زیندوو بێت؟! بۆچی هێشتا نەتەقیوەتەوەو پارچە پارچە نەبووە بەهۆی ئەو بارە قورسەی ئێش و ئازارو پەژارەی مرۆڤایەتیە زۆرەی کە هەڵی گرتووە ؟!"

باوکی بۆلیا پرۆفیسۆر فیخرۆف لەو ڕۆمانە، هەردەم دەناڵێنێ بە دەست بێ متانەیی و ترس. بۆنی گەنیوی دوودڵی و گومان لێک کردن وا لە خەڵک دەکات متمانەیان بەیەک نەبێ. هەروەها ڕۆمانەکە نیشانی دەدات کەوا ئەو خەڵکەی لە کێڵگە گشتیەکان دەژێن لە ڕاستیدا خەڵکێکی دڕندەو سەرەتایین.

ترس و دەمارگرژی و دژواری داوایە ناماقوڵەکان دەستی بەسەردا گرتوون، دەیانبینی بەماندوویی بەدەم ڕێگاوە دەست دەکوتن لە نێو (تۆپەڵە درۆیەکان!)

## شولوخۆف: ئەدیبانی سۆڤیەت گیانی مردوون

لە ساڵی ١٩٥٣ فیرابانوڤا کە ئافرەتێکی ڕۆمان نووس بوو، سێ ڕۆمان لە ڕۆمانەکانی خەڵاتی ستالینیان وەرگرتبوو، لەو ساڵە ڕۆمانێکی بە چاپ گەیاند بەناویشانی (وەرزەکانی ساڵ) ئەو ڕۆمانەی بە پێچەوانەی ئەوانی تر هیچ جۆرە ماستاو ساردکردنەوەو مەرایەکی تێدا نەبوو دەربارەی بارودۆخی ئەو کاتە، هەروەها هیچ فێڵ و تەڵەکەی تێدا نەبوو بۆ داپۆشینی ڕاستیە وروژێنەرەکان دەربارەی ژیانی وشک و سەختی ژێر سایەی پرۆلیتاریای سۆڤیەتیدا. لەو ڕۆمانەدا بەچەندەها نموونە لە مرۆڤی سۆڤیەتی ئاشنا دەبین، لە بە ڕێوەبەری نەزان و بەرتیل خۆری کارگەوە بگرە، هەتا کرێکاری زەحمەت کێش و ڕەنج بەفیرۆچوو کەبۆتە ئامێرێک و بەس.

بەڵام ڕۆمانەکەی ئەهرینبێرگ (توانەوەی سەهۆڵ) ئەو ناونیشانەی کە بووە دروشم و داوای گەل، دەربارەی ژیانی خەڵکێکی سادە و ساکاربوو، کە لە یەکێ لە وڵاتانی(ڤۆلکا)دا دەژیان. ڕۆمانەکە ژیانی کرێکار نیشان دەدات وەک ژیانێکی پڕ نائومێدی و چەرمەسەری. کەسەکانی ڕۆمانەکە بریتین لە: پیرەمێردێکی کۆمەنیست کە ناوی بوخۆفە هێشتا هەندێک بیرو باوەڕی ماوە، چونکە پاسەوانێکی کۆنی کۆمەنیستە، دووەمیان ناوی سابارۆفە، وێنەگرە کەلەبرسان لاکەی لێوە دێت، چونکە

ناوی خراوەتە ناو لیستەی ڕەشەوە، بەڵام پاڵەوانی سیاسی ڕۆمانەکە فولودیا بۆخۆفە، کوڕی پیرەمێردە کۆمەنیستەکەیە، وێنەگرێکی سەرکەوتووە چونکە پەیوەندیەکی باشی هەیە بە گزیری پۆلیس. دەبینین زۆر بە لوتبەرزی و خۆهەلکێشانەوە بە سابوک دەڵێت:"ئەگەر خودی ڕافاییلی زیندوو بایە لە یەکێتی هونەرمەندانی سۆڤیەتی نەدەهاتە وەرگرتن".

ئەو ڕۆمانەو ڕۆمانەکانی تری هاوچەشن وێنەیەکی ڕاست و بێ ڕتووشمان دەداتە دەست، دەربارەی بارودۆخی ڕاستی یەکێتی سۆڤیەت. لە پاش ئەوە بەچەند ساڵێک نوسەرێکی پۆلۆنی بەتەواوی وەسفی بار ودۆخەکەی کردو گوتی:"پێویست ناکات بڵێین مرۆڤ دەبێت لە نێو دێرەکان بیرو ڕای ڕاست و شاراوەی دەست بکەوێت".

ماوەی ( والابوون) بەردەوام بوو، نوسەران و ئەدیبانی سۆڤیەتی کەوتنە نوسین بە بوێریەکی بێ وێنە دەربارەی هەموو ئەو شتانەی کە زاتیان نەدەکرد بیان نوسن لەسەردەمی ستالین دا. ئەو بوێریە گەیشتە چڵە پۆپەی کاتێک خرۆتشۆف و تارە بەناوبانگەکەی لە ساڵی ١٩٥٦ دەربارەی تاوانەکانی ستالیندا خوێندەوە. هەر لەو کۆبونەوەیەدا میخائیل شۆلۆخۆف ڕۆمان نووسی مەزنی سۆڤێت هێرشی کردە سەر هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەدەب لەلایەن حیزبەوە، زۆر بە ڕوونی گوتی:"یەکێتی نووسەرانی

سۆڤیەت تێکڕایان ٣٧٧٣ ئەندامی گۆش کراون بە قەڵەم و بەهرەی ئەدەبی بەڕادەی جیاجیا. بەڵام وریا بن و لەو ژمارەیە نەترسن و دڵیشتان پێی خۆش نەبێ، چونکە بەشی هەرە گەورەی (گیانی مردوون) هیچیان لەباردا نییە لەسەری بنووسن، چونکە یەکێتی نووسەران لە ڕێکخراوێکی باڵاوە کرایە دەزگایەکی کارگێڕی، هەرچەندە کە سکرتاریەت بە چالاکیەوە کۆبوونەوەکانی خۆی دەبەست، بەڵام هیچ کتێبێک لە ئارادەنەبوو. هەروەها بەئاشکرا دیار بوو کە فادێف (سکرتێری گشتی) ، ئەڤیینداری دەکرد لەگەڵ دەسەڵات داران. ئایا نەدەبوایە یەکێک بە ڤادێڤی بگوتایە لە زووەوە کە (یەکیەتی نووسەران کەتیەبیەکی عەسکەری نییە و زیندانێکی تەربیەت دان نییە تا بیخاتە ژێر دەسەڵاتی ڕووتی خۆیەوە".

لە ئایاری ١٩٥٦ فادێف خۆی کوشت بەڕەسمی ماتەمیان بۆی گێڕا، پاسەوانی شەرەفیش پێکهاتبوون لە خروشۆف و مولوتوف و بولفانین.

# ئەلیجەر: دەنگمان دا بۆ ساختە و بوختان هەڵبەستن

لە کاتی بەستنی کۆنگرەی بیستەم هەوڵدان بە هێدی بەردەوام بوو بۆ گەڕاندنەوەی ڕیزی زیندان کراوە ستەم لێکراوەکان، هەروەها جاڕی گەردن ئازادیی و بێ تاوانی زۆر لە نووسەرە ناودارەکانی شۆڕش درا، کە جارێکی تر بەدیار کەوتنەوە لە پاش بەسەر بردنی چەندەها ساڵ لەسیاچاڵەکاندا. لەمەودوا بەسەربەستی کۆ دەبونەوە لە گەڵ هاوڕێیانیان.

لە ڕوسیاو ئەرمێنیاو هەنگاریاو لاتیڤیاو چیکۆسلۆفاکیا، هەموو شوێنەکانی تر شاعیران خەباتیان دەکرد لەدژی ئەو ڕاستیە تاڵە، لەوانەش کچە شاعیری سۆڤیەتی مەرگرێتا ئەلیجەر کە شیعرێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: (ڕاستی) چەند دێرێکی بڵاودەکەینەوە:

**هاوڕێ یەکەم لە تافی لاویتیدا**

**دوژمنان ڕیسوایان کرد بە دڵ ڕەقی**

**ئەی خۆشەوست ترین کەس لەبەر دڵم**

**من دەزانم ئازارو ئەشکەنجەت لە بیر ناچێ**

**دەزانم ڕیسواکردن و مل پێ کەچ کردنت**

لە یاد ناچێ چونکە تۆ خەمۆکی

لەبیرتە گوتمان دەبێ شتێک هەبێ

دەستی هەمە پرسەمان بۆ درۆو بوختان

بەرزکردەوە، نەک بۆ ڕاستی وتن

ئای لەو شورەییە پڕ ئازارە

هەوڵم ئەدا بەرگریت لێ بکەم

ئەو چەند دێرەی خوارەوەش هی شیعرێکە بە ناونیشانی (ئەو ساڵە) لە دانانی ئولگا برغولتز:

ئەو ساڵە وای لێکردم ژیانم هەمووی بە بیر بێتەوە

لەناو هەموو شتێک سەرلەنوێ ژیامەوە

لەو ساڵە کاتێ هاوڕێکانم لە قوڵایی دەریا

و لەژێر زەمینەکان بەدەستە دەگەڕانەوە

بۆچی دەبێ ڕاستی بشارمەوە

بۆچی نەڵێم زۆربەیان هەرگیز نەگەڕانەوە

## هەڤدە ساڵ، هەڤدە ساڵی درێژە بەترش و تاڵییەوە!

لەکۆبونەوەیەک لە ئازاری ١٩٥٧ـدا، کە ئەدیبانی مۆسکۆ بەستیان، دودنتسین گوتی: "وابزانم وەک دەست پێکەرانێک لێمان دەگەڕێن کەوا بەتەنیا مەلە بکەین، بە بێ یارمەتی بۆ تاقی کردنەوەی بەختی خۆمان لە خنکاندا. بەڵام بەداخەوە، هەردەم هەست دەکەم شتێک پێ بەستم دەکات، شتێک وەک ئەو دەسرازەیەی کە منداڵی پێوە دەبەستنەوە بۆ ئەوەی بەرنەبێتەوە، ئەوە قەدەغەم دەکات لەمەلە کردن".

# هێرش کردنە سەر (هەقیقەتی) سۆشیالیزم

لە ماوەی (واڵابوون) نوسەرانی سۆڤیەتی چەند هێرشێکی نوێ یان کردە سەر تیوری هەقیقەتی سۆشیالیزم. لە هەموو هێرشەکان توندتر هی خاوەنی شیعری (ئەفسانەیەکی ڕۆژهەڵاتی) بوو، دەبا خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی ئەم شیعرەدا وەک خوێنەرە ڕوسییەکان دەستەواژەی (خان ئەحمەد) بگۆڕن بە (هەقیقەتی سۆڤیەتی) ئەگەروات کرد هەقیقەتی سۆشیالیزم بەدیار دەکەوێت:

سێ وێنە

(ئەفسانەیەکی ڕۆژهەڵات)

لە نووسینی سیرجی میخالکۆف دانەری سرودی نیشتمانی سۆڤیەتی.

**ئەحمەد خانی خاوەنشکۆ ویستی**
**وێنەیەکی بۆ بکێشین**
**خان یەک دەست و یەک چاو بوو**
**فەرمانی میرانەی دەرکرد**
**بۆ هەرسێ وێنە کێشەکانی**
**بۆ جێ بەجێ کردنی مەرامی**
**گوتی دەیەوێ خۆی ببینێ**

لە سەر ئەسپێک لەگەرمەی شەڕدا بێت
دەهۆڵی جاڕ لێدان بۆ ئەو مەبەستە لێدرا
دوو وێنە کێشی یەکەم وێنەکانیان نارد
وێنەی یەکەم وای تووڕە کرد
ئاگری تورەیی گشت لەشی داگرت
چونکە وێنە کێشەکە بەهەڵە وێنەکەی کێشا بوو
دەستەکانی خان لەسەر تیرو کەوانەکە بوو
چاوەکانی تیژو دەدرەوشانەوە
خان گوتی من یەک چاو ویەک دەستم هەیە
ئەو وێنە کێشە تەڵەکە بازە
چۆن زات دەکات وێنەکەم بگۆڕێ
دەبێت تۆبە بکات و تەمبێ بکرێ
ئەو دوو ڕوە دەبێ خاک بەدەر بکرێ
(خان ئەحمەد) بە تووڕەی نەڕاندی بەسەر وێنە کێشی یەکەم
خانی مەزن لەجاری پێشوو تورەتر بوو
گوتی من باش دەزانم چی لە دوای پیلانەکەتە
هەی پیس و چەپەڵی دوو ڕوو
دەتەوێ دوژمنم پێ خۆش بکەی
دەتەوێ دووپاتی کەیەوە خان ئەحمەد
یەک دەست و یەک چاوە

بەو شێوەیە وێنە کێشی دووەمیش کوژرا
ئینجا نۆرەی وێنە کێشی سێ یەم هات
وەک بی ناو ئاو دەلەرزی
دوا وێنەی لەدەستدا بوو
خان ئەحمەدی لە گۆشەیەکەوە وێنە کێشا بوو
بە جۆرێک دەم و چاوی بەتەواوی دیار نەبوو
کەس نەی دەزانی چاوی ڕاستی
و دەستی ڕاستی لە  شوێنی خۆیان نین
دەستی چەپەی بە قەلغان بوو
چاوی ڕاستەشی کە ساغ بوو
وەک چاوی باز دەدرەوشایەوە
بەو شێوەیە ئەو وێنە کێشە بلیمەتە دەولەمەند بوو
پلەو پایەشی بەرزتر بۆوە
کاتێکیش مرد میدالیایەکی زۆریان خستە سەر گۆڕی
زۆر جاران هونەرمەندانمان هەمان شت دەکەن
هەمان ڕێگا دەگرنە بەر
وێنەی ژیان ڕوو بەڕوو ناکێشن
بەلکو لەیەک لاوەو لەیەک گۆشە دەیکێشن

لە ئایاری ١٩٥٧ لێپرسراوانی یەکێتی نووسەران داوایان لە نووسەرانی سەردەمی واڵابوون کرد، کە پاشگەزببنەوە لە قسەکانیان، بەڵام ئەوان ئەو داوایەیان ڕەت کردەوە. بەڵام هیچیتر هێرشیان نەکردەوە کاتێک بە ئاشکرا نیشانەکانی دیکتاتۆریت لە ئاسۆ بەدیار کەوتن، لەپاش پاکسازی کردنی (دەستە نەیارانی حیزبی) کە پێکهاتبوو لە مانکۆف و مولوتوف و کاغانوفتش و چەندانی تر، ڕۆژنامەی (لیتراری گازیت)ی ڕەسمی لە ٩ی تەمموزی ١٩٥٧ گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کەوا پەیوەندیەکی ڕاشکاو هەیە لە نێوان دەرکراوان و بانگەوازی کردن بۆ گێرەشێوێنی کە خەیاڵی کەوتبوە سەری نووسەران، گزیری پۆلیسیش لیونید سۆبولیوف ڕۆژنامەی (لیتیرا تورنایا موسکوڤا)ی تاوەنبارکرد بە ژەهراوی کردنی بیرو هۆشی لاوانی سۆڤیەت لە دوو ژمارە لەژمارەکانیدا. هەروەها هەڕەشەی لە نووسەری دوو وتارەکە کرد بە دەرهێنانی تەدابیری ئیداری لەدژیان.

لە پایزی ١٩٥٧ مرگریتا ئەلیجەر ڕەخنەی خودی لە خۆی گرت، بەڵێنی دا کە هەرگیز لەیاد نەکات کە ئەدیبی سۆڤیەتی هەر کارێک ئەنجام دەدات ئەوە کارێکی سیاسییە، ئەو کارەش دەتوانرێ بە شێوەیەکی ڕاست ئەنجام بدرێ بە پەیڕەو کردنی پلانی حیزب و شێوازی حیزب بەبێ دوو دڵی، هەروەها بە پەیڕوکردنی ڕژێمی ڕەفتارکردنی حیزبی!

## فادیف: تەنها شەیتان دەزانێ سۆشیالیزم چییە

بگرەو بەردە لە نێوان نوسەرانی سۆڤیەت و گزیرانی پۆلیس بە درێژای ساڵی ١٩٥٨ بەردەوام بوو، گزیرانی پۆلیس سور بوون لەسەر گەڕانەوەی ئەدەب بۆ بن باڵی دیکتاتۆریەتی حیزب. بەڵام سەرکەوتنێکی چاکیان بەدەست نەهێنا.

لەو بەیاننامەی کە گزیرانی پۆلیسی سیاسی دەریان کرد، وشەکانی سینگ فراوانی و مرۆڤایەتی و سەربەستی و تاکایەتی لێبوردەیی ببوونە زاراوە دزێوەکان هەروەک چۆن لەسەردەمی ستالین وابوو.

لە نیسانی ١٩٥٨ میخائیل شۆلۆخۆف کە بەنووسەری یەکەمی یەکێتی سۆڤیەت دەژمێردرا سەردانی چیکسلۆفاکیای کرد.

لە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ڕۆژنامەگەری چیکسلۆفاکیا بەئاشکرا هێرشی بردە سەر سەرەتاکانی جیدانۆف و گومانی کرد، لە بوونی شتێک بەناوی (ڕیالیزمی سۆشیالیزمی)، هەر لەو چاو پێکەوتنەدا داوایان لێکرد سۆشیالیزمیان بۆ دیاری بکات، لە وەڵامدا گوتی:"تیۆرەکان لە بواری لێکۆڵینەوەکانی مندا نین. من تەنها نووسەرێکم و بەس لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم باسی شتێکتان بۆ بکەم کە لە نێوان من و ئەلکسەندەر فادیف ڕویدا، بەر لەمردنی بەماوەیەکی کوت، لەو دانیشتنە هەمان پرسیاری ئێوەم

ئاراستەی كرد، لە وەڵامدا گوتی:"ئەوەی ئەم پرسيارەم لێبكات بەويژدانێكی ئاسودە وەڵامی دەدەمەوە:(تەنها شەيتان دەزانێ سۆشياليزم چييە!! من واتە (شۆلۆخۆف) سۆشياليزميم؟ كاتێک ئەو پرسيارەم لێدەكەن دێتە بيرم كە چۆن تيۆريستە (منظر) ماركسيەكان دەربارەی نوسينەكانم گوتيان نوسينێكی (كولاكی)ين. لە پاشان بومە نووسەرێكی شۆڕشی چەواشە، لەو ساڵانەی دوايدا دەڵێن من بەدرێژای ژيانم سۆشياليزمی واقعی بوومە!!".

ئەو جۆرە ئاماژانە بە زۆر بەديار دەكەوتن لە بەياننامەو وتارەكانی نووسەرە سۆڤيەتەكان. هەموو ئەو وتارو بەياننامانە پەنجەيان درێژ دەكرد بۆ رژدی و پێ داگرتنی ژمارەيەكی زۆر لە نووسەرە سۆڤيەتەكان لەسەر دەست پێوەگرتنی مافی خۆيان. چونكە ئەو سەرەتايە پيرۆزەی كە دەڵێت (حيزب هەميشە لەسەر هەقە) مايەی تەشەرو توانج لێگرتن بوو، هەتا خەڵک هەڵوێستە جياجياكانی حيزبی دەربارەی ئەدەب لەياد بمێنێت. تۆ بڵێی كام كات حيزب لەسەر هەق بوبێت؟! ئەو كاتەی وتيان شۆلۆخۆف نووسەرێكی كۆلاكييە؟ يان ئەو كاتەی وتيان دوژمنی گەلە؟! يا ئەو كاتە بۆ دوا جار گوتيان سۆشياليزمی ڕياليزمە؟! ئەو جۆرە پرسيارانە لە مێشكی زۆر لە نووسەران و دەخولايەوە، هەر بە خولاوەييش دەمايەوە. زۆر جارانيش لە شيعرەكان ئاماژە دەكرا بۆ سنوری پۆڵاينی داخراوی نيشتيمانی سۆڤيەتی، هەروەک لەو شيعرەی

خوارەوە بەر چاومان دەکەوێت کە یەڤگینی ئەفتونشکۆ نووسیویەتی:

سنورەکان پەستم دەکات
ئای کە شتێکی نامۆن
بۆینس ئایرس-م نەبینیوە،
دەمەوێ تاکو بێزاری دام دەگرێ
یاخود خرپەی دڵم زەنگی دێ
بە جیهانا بسورێمەوە، بسورێمەوە!
دەمەوێ لە لەندەن قسە بکەم
ئەگەرچی زمانەکەشم پچڕ پچڕ بێت
لەگەڵ هەموو کەسێک بدوێم
وەک منداڵێک بدوێم
دەمەوێ سواری (پاس)بم
بەیانییەک لە پاریس
من هونەرێکی هەمەڕەنگم دەوێ
وەک خۆم

ڕۆژنامەی (لیتەر ناتویا گازیت) لە ٨ی نیسانی ١٩٥٨ دەربارەی ئەو شیعرە گوتی:"لەوانەیە شتێکی بێ هودە و بێ نێوەڕۆک نەبێت ئەگەر یەڤگینی تەنها بیەوێت لە لەندەن و پاریس بسوڕێتەوە،

بەڵام ئەوەی مایەی هەراسان کردنە ئەوەیە یەڤگینی شورەیی پێ دێت لە ناو سنوری یەکێتی سۆڤیەت دا بژی".

## دژە هێرش بۆ سەر نوسەرانی ماوەی والآبوون

تونترین دژە هێرش دژی نووسینەکانی دوای ماوەی (واڵابوون) لە ڕۆمانەکانی کوشیتۆف (برایانی یارتۆف)وە دەستی پێکرد. ئەو ڕۆمانە کە لە هاوینی ١٩٥٨ چاپکرا، لە مۆسکۆ ناویان نا (ڕۆمانی دژی دودنتسیف)، چونکە پاڵەوانەکانی بەوە نەوەستان تەنها هێرش ببەنە سەر خاوبونەوەی ئەدەبی بەڵکو گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە هێرشیان بردە سەر بڕیارەکانی کۆنگرەی بیستەمی حیزب، هەڵمەتیان کردە سەر ستالین و هەروەها هێرشیان کردە سەر بەرەڵاکردنی زیندانی و گیراوەکان.

کۆشیتۆف گوتی:"لە ساڵی ١٩٥٣ زۆر لە تاوەنبارو توخمە گەندەڵەکان ئازادکران، ئەو بارودۆخەی کە ئەو تاوەنبارانە هێنایانە کایەوە، بە تووندی کاری کردە سەرلاوانی سۆڤیەت".

دوایی کۆشیتۆف بەرگری کرد لە بریقەدارکردن وپیا هەڵگوتن، گوتی:"ئایا پێ هەڵگوتن و ستایش کردن هەڵەیە؟! هونەرمەندان هەردەم بە بەشکۆمەندیەوە هەڵدەڵێن، ژیان بەبێ ئاکاری باڵاو بەرز ئەستەمە، کاتێک پێم دەڵێن نموونەو ئاکاری باڵا لە گۆڕێدا

نییە دەزانم مەبەستیان چییە. دەیانەوێ بڵێن. تۆ ٣٩ ساڵان هەوڵی فێرکردن و پەروەردەکردنی خەڵکت داوە، بەڵام مرۆڤەکان هەروەک خۆیان ماون، نەگۆڕاون. دەیانەوێ بڵێن: هاوڕێ نوشوستییت هێنا لە گۆڕانیان دا".

لە هەمووی سەیرتر یەکێک لە پاڵەوانانی ڕۆمانەکەی کۆشیتۆف بە دەم گلەییەوە دەڵێت:"من ناوی خۆم ناوە بە بنیات نەری کۆمەنیستی، بەڵام زەبوونم لە بنیات نانی ژیانی تایبەتی خۆم، من نەمتوانی چارەسەری گیروگرفتی بەختیاری تایبەتی خۆم بکەم".

بەگوێرەی هەلوێستی حیزب بەرامبەر ئەدەب لەسەردەمی خرۆشۆف مەسەلەی باسترناک لە ساڵی ١٩٥٨ دا باشترین نمونەیە کاتێک ڕۆمانەکەی باسترناک (دکتۆر زیفاگۆ) خەلاتی نۆبڵی ئەدەبی ئەو ساڵیان پێ بەخشی، سۆروکۆف بە پلە پرۆزکێ خۆی گەیاندە میلانۆ بۆ ئەوەی نەهێڵێ چاپی بکەن. لە پاش ئەوەی هەوڵەکانی سورکۆف سکرتێری یەکەمی نووسەران بە فیرۆ چوون هێندەی نەما لەڕوسیاش چاپی بکەن.

گزیرانی پۆلیسی سیاسی، بە هەموو شێوەیەکی سزادان هەڕەشەو گوڕەشەیان لە باسترناک کرد، ئەگەر هاتوو ڕۆمانەکەی لەچاپکەرە ئیتاڵیەکە وەرنەگرێتەوە. هەروەها کەڵە گزیری

پۆلیسیش لە وتووێژێکی تۆمارکراودا چارەنووسی (بەلنیاک)ی بە بیرهێناوە کە چۆن گوللە باران کرا، بەهۆی بڵاوکردنەوەی یەکێک لە بڵاوکراوەکانی لە هەندەران. کاتێکیش ئەو کتێبە بەهەرمێنترین کتێب دەرچوو خەڵاتی نۆبڵیشی پێدرا، تەنگیان بەباسترناک هەڵچنی تاخەڵاتەکە وەرنەگرێ، هەروەها دەریان کرد لە ئەندامیەتی یەکێتی نوسەران. هەروەها نازناوی (نووسەری سۆڤیەتی)یان لێ یاساغ کرد، بەرەسمی پێشیان ڕاگەیاند کەوا چارەنوسێکی دڵتەزێن چاوەڕوانی دکتور زیفاگۆ دەکات، هەروەها دانەریش چارەنووسی سوک و چروکییە.

بوریس باسترناک تەنها نووسەرێک نەبوو، کە بەرەسمی سزا بدرێت لە ساڵی ١٩٥٨، ئەوەتا کۆنستانیتن سیمونۆڤ شاعیرو ڕۆمان نووسی سۆڤیەتی کە خەڵاتی ستالینیشی پێدرابوو، ئەوەی بەر لە ئەو کاتە چەندەها پلەو پایەی داگیر کردبوو لە حیزب و چەندەها میدالیای بەرزیشیان پێدا بوو، لە پڕێکدا گڕی تورەیی حیزب پەروباڵی ئەویشی سووتاند لە سەرۆکایەتی نووسینی گۆڤاری (نوڤی میر)یان خست و دوور خرایەوە بۆ ئۆزبەکستان.

## بۆچی ڕەخنە لەو کۆت بەدکاریانە ناگرین کەبەڕاستی هەن

سیمونوف یەکێک بوو لەنوسەرە ناودارەکانی حیزب، زۆریش ناحەزبوو لەلای نووسەرانی یەکێتی، هەتا جارێکیان شۆلۆخۆف دەرهەقی گوتی:"دەبێ لاوەکانمان چ لەو بۆرە پیاوە فێربن، جگە لە هونەری ڕەفتارکردنی دبلۆماسیانە نەبێ". لەگەڵ ئەوەشدا نۆرەی سیمۆنۆفیش هات بۆ بەسەرداکردنی جامی خەشم و قینەی خرۆشۆف چونکە لە ماوەی (والابون) ڕەخنەیەکی توندی ئاراستەی بارودۆخی ئەدەب کردبوو، گوتبووی:"چەواشەکردنی ژیان لە ئەدەبی سۆڤیەتیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەنەبوونمان بۆ ڕەخنە گرتن لەو کۆت و زنجیرە نا تەواوانەی کە بەڕاستی لە ژیاندا هەن".

بە ڕێکەوتیش نەبوو کەوا کرداری چەواشەکردن و ماڵشت و کردن گەیشتە ئەو پەڕی لەو نوسینانەی دەربارەی ژیانی لادێ نووسرابوون، چونکە زۆربەی کەم و کورتی و هەڵەکان لەلادێ بوون، جیاوازی نێوان بارودۆخی هەقیقی و شێوازی باسکردنی لادێ وەک جیاوازی نێوان ئاسمان و ڕێسمان بوو، بۆ چەندین ساڵ".

ئەو ئاماژە دیبلۆماسیە لە سۆنگەی بارودۆخی ڕاستەقینەی چارەنووسی ڕەشی جوتیارانی سۆڤیەت هات، هەروەها ئەو تۆقاندنە بەکۆمەڵ کوشتنانەی بووە هۆی سەپاندنی کشتوکاڵی گشتی بەسەر لادێیەکان، هەروەها ئاماژە دەکات بۆ ئەو ڕۆمانە

پڕوپاگەندەییانەی کە نوسرابوون بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ ئەو بەختیاریەی کە جوتیارانی سۆڤیەت گوایە تێیدا دەژیان، ئەو ڕۆمانانەی لەدوایدا بوونە مایەی گاڵتە پێکردنی نوسەرانێکی زۆر. یەکێکیان دەربارەی ئەو ڕۆمانانە گوتوبووی: "نمرەی پێوانەیی جیهانی یان تۆمار کردوە لەو قسانەی کە لە ئەنجامی ترسەوە دێنە نووسین".

کاتێک کۆنگرەی سێیەمی هەموو یەکیەتی نووسەران بەسترا، خرۆشۆف و نزیکەی نیوەی ئەندامانی بریزیدیۆمی حیزب ئامادە بوون. لەو وتارە درێژەی کە خرۆشۆف بۆ نووسەرانی خوێندەوە فریشتەی ئاشتی لە ئاسماندا دەخولاندەوە، ئینجا بەڵێنی بەنووسەرە نوێ خوازەکان دا، کەوا لەمەودوا کەس نایان چەوسێنێتەوەو ڕاونانرێن بەمەرجێک مل کەچ و گوێڕایەڵی خۆیان بسەلمێنن. لەگەڵ ئەوەشدا ڕژێمی یەکێتی نووسەران ئەو بەندەی خرایە سەر:"یەکێتی نووسەران جەنگێکی بێ پایان و خۆگرانەی بەرپاکردووە دژی هەموو جۆرە لادانە ئایدۆلۆژیەکان، لەسەروی هەموانەوە دژی نوێ خوازی، لەهەمان کاتدا بەدەستێکی پۆڵاین دەجەنگێ دژی باوەڕگەریەتی و لوتبەرزی و ڕەفتار زبری".

دروشمی کۆنگرەکەش (ئەدەبێکی مەزن بۆ سەردەمێکی مەزن) بوو، بە مەرجێک ئەو ئامانجە لە ڕێگای (ڕیالیزمی سۆشیالیزم) و لەژێر چاودێری و ئاراستەکردنی حیزب بێتە دی.

لەو کۆنگرەیەدا خرۆشۆف و گەورە پیاوانی ئەدەب هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریان دا بۆ بەرگریکردن لە (پاڵەوانی ئیجابی) کە ڕاستی ڕوکەش دەکات بەنیازێکی باش. لە ڕاستیدا ئەو کۆنگرەیەش جیاوازیەکی زۆری نەبوو لەگەڵ کۆنگرەکانی تر.

## دیکتاتۆریەتی بیرۆکراتی ڕووی ڕاستەقینەی ئاشکرا دەبێت

هەر وەک لەکۆنگرەی پێشو رویدا، لەو کۆنگرەیەش چەند نوسەرێکی لادەرڕێزیان بۆ گەڕاندرایەوە لەپاش پەشیمان بوونەوە و تۆبەکردن. لەوانەش مەرگریتا ئەلیجەر ورڕ-یاشین.

لەو کۆنگرەیەش چەند دەنگێکی ئازادی لێوە بەرز بۆوە کە پەنجەی ئاگاداری هەڕەشەکردنیان دەهەژاندەوە. بۆ نمونە ئەلکسەندەر توادوفسکی گوتی:"ئێمە هیچتر ناتوانین بەو تەرزە بژین، پێویستە ئەوە بڵێین دەربارەی ئەدەبی دوێنێ و هەتا ئەدەبی ئەمرۆشمان".

باوستۆ فسکیش گووتی:" ئەگەر هاتوو نووسەران تەنها هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ بابەتە باوەکان (ئەوەی بۆیان دیاری دەکرێ) هەرگیز ئەدەبێکمان نابێت پڕبە مانای وشە".

لە پاش ئەو ئاگادار کردنەوانە نووسەران بڕیاریان دا کە بە جەرگ سۆزی بانگەوازی بکەن بۆ پرۆژەی حەوت ساڵی. تەنها ئەو شتەی کە سەیرو سەمەرە بوو، لەو کۆنگرەیە ئەوە بوو، کە سکرتێری یەکەم ڕاپۆرتێکی پێشکەش کرد تێیدا دووپاتی کردبۆوە کەوا یەکێک لەئەرکەکانی مێژوو نووسان و ڕەخنە گران بریتیە لە دۆزینەوەی چارەسەری دڵنیاکەر بۆ گرفتە تیۆریەکانی (ڕیالیزمی سۆشیالیزم).

لە پاش کۆنگرەی بیست و یەکەمی ساڵی ١٩٥٩ دیرەگەکانی (کۆڵەگەکانی) دیکتاتۆریەتی خرۆشۆف ڕەگیان داکوتاو فەلسەفەی (یەک پیاو ڕاستی لەلایە)ش سەر لەنوێ گەڕایەوە، هەر لەدوای ئەوەشدا هەڵەوکانی وەگرکەوتنەوە بۆ بەچاوەشکردنەوەی نووسەران و ئەدیبان لەدیوەخانەی حیزب دا.

بەڵام بێ گومان چەندین بەربەست هەبوون لەڕێی زیندوو کردنەوەی سەردمی تۆقاندن. لەوانەش ماوەی حوکمڕانی ستالین و ئاشکرابوونی ئەو جینۆسایدانەی کە ئەو ئەنجامی دابوون کە نەدەکرا وا بەئاسانی لەمێشکی خەڵک بسڕێتەوە. هەروەها پۆلیسی نهێنی هەمان ترس و هەیبەتی جارانی لای خەڵک نەمابوو. جیهانی کۆمەنیستیش تووشی بومەلەرزەی گەورە ببوو، لە مەسەلەی تیتۆوە بگرە تا هەنگاریاو تیبت. هەر لەکۆنگرەی بیستەم بوو ئێسکە پەیکەری تیوری بەند لەسەر ماکسیزم و لینینزم توشی چەپۆکێکی وا توند هات، کەبنچینەکانی هێنایە لەرزین.

لەبەر ئەو هۆیانە ئیتر بۆ گزیرانی پۆلیس ئاسان نەبوو بەتەواوی دەنگی ئازادی نووسەران خەفەبکەن. نووسەرانیش، هەمان بڕوای کوێرانەشیان بە ڕابەرەکان و، بەو پاڵەوانێتیانەی کە هەست و سۆزی دەبزواندن لەپاش سەرکەوتنی شۆڕش نەمابوو.

چونکە هەر ئەو شۆڕشە هەزارەها ڕۆڵەی خۆی هەڵ لوشی.
هەروەها ڕووی ڕاستەقینەی بیرۆکراتیەتیش ئاشکرابوو، سەرباری ئەوانەش نەوەیەکی نوێی گەلانی سۆڤیەتی و ئەدیبانی سۆڤیەت لەئارادا بوون. بەو شێوەیە وادیاربوو هەڵچون و جۆش سەندن بەردەوام بوو، هەتا دەهاتیش هەوێنەکەی پتر کاری خۆی دەکرد.

# نوسینی دژی جەور وستەم لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات

## لەبانگەوازی کردن بۆ کۆمەنیستی تا شۆڕش کردن لەدژی

وڵاتانی ژێر چەپۆکی یەکێتی سۆڤیەت یان باشترە بڵێین مۆڵگەکانی یەکێتی سۆڤیەت جیابوون بەپێی ڕابردووی سیاسی و ئاستی ڕۆشنبیری، هەروەها لەچەند بوارێکی تریش جیاوازن. بەڵام مەرگەساتی نووسەران لەو وڵاتانەدا تاڕادەیەکی زۆر لەیەک دەچێت. لەوانە زۆربەی ئەو وڵاتانە لەژێر داگیرکردنی نازیەکاندا بوون، هەروەها ڕۆڵەکانیان ناردرانە سەربازگەکانی گرتن، کەزۆربەی خەباتگێڕە نیشتمان پەروەرەکانی بەخۆوە گرتبوو.

لەسەرەتاوە خەڵک لەسۆنگەی مۆتەکەی نازیانەوە وایان زانی لەشکری سوور سەربەستی و ئازادیان بۆ دێنێ. زۆربەی نووسەران و بیرمەندانیش وایانزانی کەوا کۆمۆنیزمی تەنها وەڵامێکە بۆ بەرهەڵستی کردنی فاشیزم.

لەبەر ئەو هۆیانە بوو کە زۆربەیان چوونە ناو حیزبی کۆمەنیستی و قوربانیان دا بە هەندێک سەربەستی بەهرەی هونەری تایبەتی خۆیان لە پێناو (بەرەبەیانی بەختیاری مرۆڤایەتی، دوارۆژ و ئایندەی پرشنگدار).

ئەوەی شایانی باسە حیزبی کۆمەنیستی لە قۆناغی خەبات کردنیدا زیاتر سەربەستی بە ئەندامانی دابوو لەو سەربەستیەی کە

لەپاش جڵەو گرتنی حوکمی تۆقێنەری پێی دابوون، بەو شێوەیە هەڵوێستی حیزب بەرامبەر ئەدەب نەرم نیان بوو هەتا ساڵی ١٩٤٨ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٩.

بەڵام لە قۆناغی گواستنەوەی بەرەو ماوەی کۆمەنیستی دووەم، واتا پاش دامەزراندنی دیکتاتۆریەت لەسەر ئەدەب، سەدەها نووسەر خۆیان لە زیندان دۆزیەوە. بەو شێوەیە دەبینین ئەو ماوەیەی کە نووسەرانی وڵاتە کۆمەنیستەکانی ئەروپای ڕۆژهەڵات تێیدا سەربەست بوون زۆر کورت بوو، بە پێچەوانەی نووسەرە کۆمەنیستەکانی ڕوسیا کە هەنگوینە مانگیان بۆ چەند ساڵێک درێژەی کێشا، پێش ئەوەی دووچاری هەمان چارەنووس ببن و خۆریان ئاوا بێ. سەر هەڵدانی دیکتاتۆریەت لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات خێراتر بوو لە ڕوسیا، بۆیە هیوا بڕان قوڵتر بوو بومەلەرزەکەش تونتربوو لەوێ.

هەروەها ماوەی سێیەمیش لە ناکاوێک هات هەتا ئەو شاعیرانەی کە خەریکی پێدا هەڵگوتن و ستایش کردنی ستالینی مەزن بوون، ببونە هەڵگری مەشخەڵی شۆڕش دژی کۆمەنیستی لەپاش مردنیدا. بەڵام ئەو زیندانیە بێتاوانانەی کە لەو ماوەیە بەردران لە ژمارە نەدەهاتن، ئەو شتانەی ئەوان دەیان گێڕایەوە لەوە نامۆترو سەیرتر بوو لەوەی ڕۆژئاواییەکان باوەڕی پێبکەن.

## ئەدیبان ویژدانی خۆیان کردە قوربانی درۆیەکی هەڵخەڵەتێنەر

جۆشانی سیاسی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات لەپاش مردنی ستالین زۆر بەهێزو بەگوڕتر بوو، دەنگوباسی شۆڕشی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و، یاخی بوونی فورکرتا و، نیشانەکانی بەرهەڵستی کردن لەهەر چوار پارچەی جیهانی کۆمەنیستی، ئاواتی خەڵکی لەهەموو لایەک زیندو کردەوە، بووە هاندەرێک بۆ نووسەران، لەلایەکی تر ڕۆژی ڕەشی کۆمەنیستە ڕادیکاڵەکان بوو، چونکە هەستیان کرد کەوا نموونەی باڵایان وردوخاش بوو، هەستیان کرد بەر لەئێستا لەگەڵ بیروباوەڕو فەلسەفەکەیان لەناو دەریایەک لە خوێن و فرمێسک دەژیان. کاردانەوەی هەندێکیان گەیشتە ڕادەی هەرەسهێنانی مێشک. هەندێکیان بتەکانیان ڕوخاندو هەندێکی تریشیان ویژدانیان ئەشکەنجەی دەدان لەبەر نەدیتنی دوورتر لەسەری لوتیان، لەبەر سەر پێ سپاردنیان بەو تاوانەی کە درایە پاڵ بێ تاوانەکان بووە هۆی زیندانی کردن و ئابڕوبردن و برسی بوونیان، بۆیان بەدیارکەوت کەوا قوربانیەکی زۆریان دا، بەتوانای داهێنان و بەکەسایەتی و بەویژدانیان، نەک لە پێناو ئایندەیەکی باشتر بۆ مرۆڤایەتی بەڵکو لە پێناو درۆیەکی کوشندەی مرۆڤ خەڵەتێندا.

شۆڕش لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات هورژمی بردە سەر گزیرانی پۆلیسی کۆمەنیستی بەو پەڕی تواناوە، لەبەر هۆیەکی تر، ئەویش

ئەوە بوو ئەو گزیرانەی پۆلیس لە ڕوانگەی گەلاندا وەک داردەستێکی بێگانەو نوێنەری وڵاتانێکی بێگانە بوون. بەو پێیە شۆڕشەکە شۆڕشێکی نەتەوایەتی بوو لە دژی داپلۆسینی ڕوسی. بۆیە دەبینین داواکردنی سەربەستی ڕۆشنبیری شان بەشانی ئارەزووی وەدەست هێنانی سەربەخۆی نەتەوایەتی بوو.

سەدەها لاوی ئەوروپای ڕۆژهەلات فێری زمانی ڕوسی ببون بەڕەوانی. چونکە فێربوونی ڕوسی بە زۆری بوو لە قوتابخانەو پەیمانگاو زانکۆکان. دوایی بەدیارکەوت کە فێربوونی ئەو زمانە چەکێکی دوو سەرەیە، چونکە هەر زوو بەزوو ئاگادار بوونەوە لە شۆڕشی نووسەرانی ڕوسی دژی هەڵوێستی حیزب بەرامبەر ئەدەب و ڕۆشنبیری، ئەهرنبورگ لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٣ لەڕۆژنامەی (زناما) نووسی:"ئەو لێپرسراوەی کە لە هەموان زیاتر دەستی تێوەر دەدایە کاروباری نووسەران بەر لەشۆڕش، نەیدەوێرا پێشنیاری بابەتی چیرۆکێک بکات لە چیکۆف. ئایا هەستی بەرزی تۆلستۆی توانای قەبوڵکردنی فەرمانی نووسینی شاکارە هونەرییەکەی (ئەناکارنینا)ی هەبوو، یان گۆرکێ دەیتوانی بە فەرمانێک (دایک) بنوسێ؟!

# ئەدەبی هەنگاری

# خوێن و زیندان شۆڕش

## ئەدیبانی هەنگاریا یەکەم ڕاپەڕیوبوون

پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی هەنگاریا پیتەر فەرز لە گۆڤاری (ئورودالمی) نووسیبوی:"هەندێک نووسەر توانای خۆگونجاندنیان هەیە، دەسەڵاتداریەتی سیاسی دەزانێ ئەو جۆرە نووسەرانە لە ڕاژەکردنی ئەودان. بەڵام جاروبار ڕودەدات ئەو (مهرج)انە چەپۆک و جەزربەی وا لە ستەمکاران دەدەن کە هەتا هەتایە دەنگ بداتەوە".

لەڕاستیدا نووسەرو ئەدیبانی هەنگاریا یەکەم کەس بوون کەلە ڕووی دیکتاتۆریەتی کۆمەنیستی ڕاپەڕین. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا بزوتنەوەی دژایەتی ستالینیزم هەر لەزووەوە لە هەنگاریا دەستی پێکرد، چونکە (ئیمری ناجی) بووە هەمەکارە لەتەموزی ١٩٥٣، هەر کە هاتە سەر کار هەڵمەتی گەڕانەوەی سەربەستیە دیموکراتیەکان یەکسەر دەستی پێکرد، ناجی لە هەموو ڕابەرانی ئەورووپای ڕۆژهەلات زیاتر لەو بوارە بڕی کرد. هەروەها ئەو یەکەم ڕابەر بوو، کە زیندانی و گیراوەکانی بەرەڵاکردو سنورێکیشی دانا بۆ تۆقاندنی پۆلیسی نهێنی. بەڵام هێشتا جەماوەر پشووی هەڵنەکێشابوو، کە دیکتاتۆری ستالیزم ڕێچکە (ڕاکۆزی)

سەرکردایەتی حیزبی گرتە دەست، دەستی کردە تەگەرە نانەوە لەبەردەم هەوڵ و کۆششەکانی ناجی.

لە پاش ڕوخانی مالنکۆف لە ساڵی ١٩٥٥ یەکسەر ئیمری ناجیان وەدەرنا لە لەسەرکردایەتی وەزارەت و لە لێژنەی ناوەندی حیزبدا، بەو جۆرە هەنگاریا دوو ماوەی ستالینی بەخۆوە دیت لەگەڵ دوو ماوەی ئازادی. بەو جۆرە ئەوروپای ڕۆژهەڵات دەکەوتە ژێر شەپۆڵە یەک بەدوای یەکەکانی ستالینزم و دژە ستالینزم بەپێی ئاراستەی یاری گوریس کێشەکێ لە نێوان ستالینیەکان و نەیارەکانیان. هەریەک لەو دوو تاقمە ورەی بەرز دەبۆوە بەپێی ئەو سەرکەوتنانەی کە هاوبیرانیان لێرەو لەوێ بەدەستیان دەهێنا.

هەرووەها هەر هێرشێک کرابا لەلایەن نووسەرێک یان ئەدیبێک لە یەکێک لەو وڵاتانە یەکسەر لە وڵاتانی تر دەنگی دەدایەوە. کێشەی ئەدەبی گەیشتە چڵە پۆپەی لە هەنگاریا لە نیوەی دووەمی ١٩٥٥ کاتێک چیرۆک نووسی ناودار غولیا های نووسی:" باڵکێشانی لەڕادەبەدەری بیرۆکراتییەت بەسەر ئەدەب هێندەی نەماوە بیکوژێ". حیزبیش یەکسەر گۆڤارەکەی لە بازاڕ گلدایەوە.

## خەبات لەپێناو ڕزگاربوون لە دیکتاتۆریەتی حیزب

لە پاش هەڵمەتی دووەمی دژی ستالینزم، کە خرۆشۆف دەستی پێکرد، لە شوباتی ١٩٥٦ بە وتارە بەناوبانگەکەی، نووسەرانی هەنگاریا بڕیاریان دا ئەدەب بەیەکجاری ڕزگارکەن لە چنگی دیکتاتۆریەتی حیزبدا، چونکە کاتەکە لەبار بوو، حیزب هەتا بن باڵان نوقمی کێشەو ناکۆکیە ئایدۆلۆژیەکان ببوو. پیاوانی پۆلیسی نهێنی هەستیان دەکرد دوا ڕۆژیان لە مەترسیدایە. هەر لەو ڕۆژگارە ئەندرێ ئەنسزی چیرۆک نووسی ناودار کرایە سەرنووسەری گۆڤاری (ئورودالمی) هەفتانە. یەکەم کار کە ئەنجامیدا ئەوە بوو بەتووندی نارەزایی دەربڕی لەدژی ئاراستەکردنی ئەدەب لە لایەن حیزبەوەو هەموو جۆرە چاودێریەک. گۆڤارەکەی کردە سەکۆیوک -منبەرێک- بۆ نووسینی سەربەست. دوابەدوای ئەوە چەندەها ناو بەدیارکەوتنەوە لە گۆڕەپانی ئەدەب پاش بزربونێکی زۆر. پەردە لە سەر هەموو بوارەکانی دیکتاتۆریەتی کۆمەنیستی هەڵدرایەوە لە ڕێگاری وتاری بوێرو شیعرو کورتە چیرۆکی بە هەڕمێن و بەپێزدا.

لەپاش نووسین بە زمانی حیزب بۆ ماوەی چەندەها ساڵ. ئەدیبان گەڕانەوە بۆ جوانسازی لە شێوازو ناوەڕۆکی ئەدەبدا. هەروەها سوربوون لەسەر ئەزموونی تایبەتی هونەری لە ئەدەبدا، هێرشیشیان کردە سەر (ڕیالیزمی سۆشیالیزم) گاڵتەیان دەکرد بەو بنەڕەتە کۆمەنیستەی کە دەیوت: پێویستە لایەنە خراپەکانی ژیان

بشارینەوە بە نیشاندانی لایەنە ئیجابیەکان، هەروەها گاڵتەیان بەو فەرمان ڕەوایانە دەکرد کە گلەییان دەکرد لە دەست ئەو نووسەرانەی کە بەتەنیا لایەنە سەلبیەکان دەخەنە بەر تیشکی ڕەخنەکانیان و لایەنی ئیجابیەکانیش فەرامۆش دەکەن.

## ڕاهاتن لەسەر بیرکردنەوە

گۆڤاری (ئوورودالمی) مایە پوچی ڕۆشنبیری و ڕەوشتی ئابووری دیکتاتۆریەتی ڕاکۆزی ئاشکرا کرد. ئەویش لە کاتێکدا کە ڕاکۆزی و دەستەو دایەرەکەی لەسەر کاربوون. هەروەها نووسەرە پێشکەوتوخوازەکان هێرشیان دەکردە سەر ئەو فەرمان ڕەوایانەی کە گیانی باوەڕیان لەدڵی خەڵکدا ڕەشکوژ کردبوو.

## (نەفرەتیان لێکە خودایە
## ئەوانە بوون باوەڕی گڕگرتوومانیان پێ خوست کرد

(تاییور تارۆس)ی شاعیرو چیرۆک نووس لەسەر زمانی زۆر لە ئەدیبانی کۆمەنیست گوتی:" ئەو بارودۆخە نالەبارەی کە پڕوپوچی مالشت کراو دروستی کرد لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی لەلایەن حیزبەوە، هەروەها بەکارهێنانی هۆیەکانی بە گوێ دادانەوە (ایحا) بووە هۆی ئەوەی ببمە کاسێتێکی کوێر (بەو شێوەیە وردە وردە لەسەر بیر نەکردنەوە ڕاهاتم).

ئیمری تاکسیش نووسی:"لەو ولاتەی کە شاعیر تێیدا بە نهێنی دەنوسێ یاساش دەبێتە ئاشوب زۆر ئاسانە ئەدیب بە چاوی خۆی ببینێ کە چۆن بەهەشتی بەڵێنپێدراوی دەبێتە دۆزەخی نەفرەت لێکراو".

ئینجا بەردەوام بوون (لەنێو هەموو چین و توێژەکان چینی کرێکاران بەر گەورەترین چەپۆک کەوت لە ئەنجامی ئەو تاوان و هەلانەی کە لە ماوەی ڕابردوودا ڕویاندا. چەند جارێک بە ئاشکرا لەناوەڕاستی نیوەڕۆ کرێکارانیان کۆت و زنجیر دەکردو پەلکێشیان دەکردن بۆ زیندانەکان، ئەوە لەو کاتەی کە ئەدیبان باسی گەورەیی و پایەی کرێکارانیان دەکرد لە لایەکی تر کرێکاران ڕاپێچ دەکران بۆ زیندانەکان... هەر ئەو کرێکارانە لەسەریان بوو باری گرانی باجەکان لەسەر شانیان هەڵگرن بۆ ئەنجامدانی پرۆژە دۆڕاوەکانیان. بەکورتی دەبوایە کرێکاران خەرجی حوکمڕانی بیرۆکراتی بکێشن کە ئەوەندە زۆر بوو لە سنووری چاوەڕوانکراو تێپەڕیبوو.

بەگوێرەی ئەو دروشمەی کە دەیوت:(بەدبەختی ئەو نەوەیە نرخێکە دەیدات بۆ رۆژێکی پڕشنگدار کە لە ئایندە دێت). ئەو قسەیە تەنیا درۆیەکی رووت بوو بەس:(چونکە ناشێت دوا رۆژی پڕشنگدار لەسەر کۆڵی ئەو کرێکارانە دروست بکرێت، کە نەکرێ دەستیان وەردەگرت، نە خۆشی دەچووە دڵیانەوە).

## ئەدیبان و کرێکاران لەیەك ڕیزن دژی دیکتاتۆریەت

تایبو دێری لە هەمان گۆڤار چەند کورتە چیرۆکێکی نووسی کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو لەناو کرێکاران، گەورە لێپرسراوان و کاربەدەستانی حیزب هەندەی نەما بوو لە حەژمەتان شێت بن کاتێ دیتیان کرێکاران و ئەدیبان لەیەک ڕیزن لە دژی جەورو ستەم. بەو شێوەیە گۆڤاری (ئرودالمی) ئەوەندە بە هەرەمێن بوو هەتا ژمارەکانی کە دەردەچوون لە ماوەی چاوتروکانێک لە بازاڕ نەدەمان، هەندێک لە ژمارەکانی لە بازاڕی ڕەش بەپەنجا بەرامبەر نرخی خۆی دەفرۆشرایەوە. چی پێنەچوو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تریش ملی هەمان ڕێگایان گرتە بەر، توماس ئەجزیل هەڵگری خەڵاتی ئەدەبی ستالینی زنجیرەیەک وتاری نووسی دەربارەی چارەنووسی جوتیاران تێیدا باسی کردبوو کە چۆن لێپرساوانی حیزب بە زەبری تفەنگ جوتیارانیان پەلکێش دەکردە ناو ڕژێمی کێڵگە گشتیەکان.

لە ٢٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ نووسەران و خوێنەرانی زانکۆ خۆپیشاندانێکی ئاشتیان لە بۆدابست ساز کرد، زیاتر لە (٣٠٠،٠٠٠) کەس ڕژابوونە سەر شەقامەکانی بۆدابست، لەپەیکەری (بتوفی)یەوە دەستیان پێکرد تا پەیکەری (جەنراڵ بین) کە دەکەوێتە ئەو بەری ڕوباری دانۆب، کە گەیشتنە ئەوێ پیتەر فێرس کە سەرۆکی یەکێتی نوسەرانی هەنگاریا ئەو بڕیارەی خوێندەوە کە نووسەران دەریان کردبوو لە بەیانی هەمان

ڕۆژدا:"ئێستا ئێمە گەیشتینە خاڵی گۆڕانکاری مێژوویی، ئێمە ناتوانین لەسەر پێ بە چەسپاوی ڕاوەستین لەو قۆناغە شۆڕشگێڕیە، ئەگەر تێکڕای گەلی هەنگاریای کرێکار بەرێکوپێکی و بەبێ سڵکردنەوە دەورمان نەدەن".

ڕابەرانی حیزب و دەوڵەت نوشستیان هێنا لە پێشکەش کردنی پرۆگرام و بەرنامەیەکی پراکتیکی (عملی) باش. ئەوانەی بەرپرسن لەو بارودۆخە ئەو کەسانەن کە لەجیاتی بەرفراوان کردنی دیموکراسی وەخۆکەوتوون بۆ گەڕاندنەوەی سەردەمی ستالین و ڕاکۆزی: واتە سەردەمی تۆقاندن لە هەنگاریا.

ئێمە نووسەرانی هەنگاریا داخوازیەکانی گەلی هەنگاریامان لە حەوت خاڵی سەرەکی کورت کردۆتەوە کە ئەمانەن:

- سەربەخۆیی نەتەوایەتی.
- چاوپێداخشاندنەوە بە ڕێککەوتن نامەکانی بیانی لەسەر بنچینەیەکی یەکسان.
- هەڵسوڕاندنی کارگەکان لەلایەن ئەندازیار و پسپۆرە کارامەکان.
- ئازادکردنی جوتیاران لە دیار کردنی مافی چارەنووسی خۆیان بە سەربەستی.

- گەل بە ئازادی نوێنەرانی خۆی هەڵدەبژێرێ لە پەرلەمان و ئەنجومەنی شارەوانی و دەزگاکانی کارگێڕی لە ڕێگای دەنگدانی نهێنیەوە.

هەر کە بولێڵی ئێوارە داهات گوللەی پیاوانی پۆلیسی نهێنی بە لێشاو دەباریە سەر قوتابیانی بێ چەک، کرێکاران و سوپای نیشتمانی و پۆلیسی ئاسایی بە یەک دەنگ ڕاپەڕین و چوونە پاڵ خوێندکاران لەو بەگژیەکداچوونەی کە هێندەی نەبرد بووە شۆڕشێکی بڵێسەدار بە پاڵپشتی دە ملیۆن هەنگاری.

**خەونمان بەشۆشیالیزمەوە دەدیت کەچی زیندان وخوێن بوو**

لەماوەی یەکەمی سەرکەوتندا واتە پێش دژە هێرشی ڕوسی ژمارە دووی گۆڤاری شۆڕشگێڕی (ئرودالمی) دەرچوو لە کانوونی یەکەمی ١٩٥٦ ئەم ژمارەیە بە گرنگترین بەڵگەنامەی شۆڕشی هەنگاریا دەژمێردرێت، لە نێو ئەوانەی کە لەو ژمارەیە نووسیبوویان تایبور دێری بوو کە تا ئێستا لە زیندانە لە پاش نوشوستی شۆڕش، لەو وتارەیدا گوتبووی:"هەڤالان من بەرپرسیارم هەروەها من شادم و شانازی پێوە دەکەم لە سۆنگەی پیشەکەمانەوە یەکەم کەسانێک بووین کە گوێمان لە دەنگی بێزاری خەڵک بوو، کە دەم و دەست گەیاندمانە گوێی کاربەدەستان".

ئەو شۆڕشە بەتەفرەدان و هاندانی کەسێک یان کۆمەڵێکی سیاسی یان بیرو ڕایەک نەبوو، بەڵکو ویستی گەل بوو. من ئێستا دەتوانم مەزەندەی ڕادەی دڕندایەتی و تاوانی فشارو زۆرە ملیٚ کردن بکەم کە گەل دووچاری هاتبوو، گەل بە تێکڕایی بێ چەک و دەست بەتاڵ بەڕووی تانکە قورسەکان ڕاپەڕی... لە سەرەتادا لەساڵی ١٩٤٥، وامدەزانی کرێکاران و جوتیاران دەکەونە نازو نیعمەتی کۆمەڵگای نوێی بەڵێن پێدراو بەڵام لە ماوەی دەساڵان وڵاتیان بست بە بست تاڵان کرد وەک بەرە لە ژێر پێ یێیان دەرهێنایەن.

وامنزانی سۆشیالیستی بنیات دەنێین بەڵام لە جیاتی ئەوە تێیان هەڵدراینە پشت دیواری زیندانەکان، ئەو زیندانانەی کە لەسەر بنچینەی خوێن و درۆ بنیات نرابوون. هاوڕێیان من هەست بە بەرپرسیارێتی خۆم دەکەم، چونکە چاوم درەنگ کردەوە، ئێمەی ئەدیبانی هەنگاریا تەنها یەک پۆزشمان هەیە، هەر چەندە درەنگ ئەنجامامان دا، ئەویش ئەوەیە ئێمەی ئەدیب دەروازەی شۆڕشمان خستە سەر پشت دژی جەورو ستەم. (خاوەنی ئەو وتارە نووسەرێکی کۆمەنیستەو مێژویەکی دوورو درێژی هەیە لە کۆمەنیستیدا کە دەگەڕێتەوە بۆ سی و شەش ساڵ) لە چواری تشرینی دووەمی ١٩٥٦ سوپای سۆڤیەتی هێرشێکی بەرفراوانی سەرتاسەری کردە سەر هەنگاریا، شێرە بەفرینەی شۆڕشی

تواندەوەو دوا پەیامی یەکێتی نووسەران لەڕادیۆی سەربەستی هەنگاریا بەو وشانە کۆتایی هات:" ئێمەی ئەدیبانی هەنگاریا داوای فریاکەوتن لە هەموو نووسەرێک و زانایەک دەکەین لە جیهاندا. لە هەموو پەیمانگایەک و یەکێتییەکی نووسەران دەکەین، هانامان بردە بەر هەموو ڕابەرێک و ڕۆشنبیرێک. ماوەکە کورتەو ئێوەش ڕاستیەکان دەزانن. هاریکاری نووسەران و زانایان و کرێکاران و جوتیاران و رۆشنبیرانی هەنگاریا بکەن، فریامان کەون، فریا ..."!

## دیکتاتۆریەت گەڕایەوە و خامۆشی و تۆقاندنیش گەڕایەوە

خامۆشیەکی سامناک باڵی بەسەر بۆدابست کێشا لە پاش حەوت ڕۆژ لە شەڕشۆڕی خوێناوی و دوو هەفتەش لەمانگرتنی سەرتاسەری، سوپای سۆڤیەتی دڵێرو بوێر هەموو بەرگریەکی لەناو برد، ئیمری ناجی و هاوڕێیانیشی قۆڵبەست کران، پۆلیسی نهێنیش گەڕانەوە سەر بەزمی جارانیان. نووسەران و کرێکاران و ڕابەران و خوێندکارانیش بە هەزارەها گیران. ژمارەیەکی زۆر لەوانە گوێزرانەوە بۆ ناو یەکێتی سۆڤیەت، لە لایەکی تر خەڵکێکی زۆر بەرەو سنورەکان ڕایان کرد ڕووەو ڕۆژئاوا. ژمارەی هەڵاتوەکان هەتا داخستنی سنور نزیکەی ٢٠٠ هەزار پەناهەندە بوو لەوانە ٥٠ هەزاریان کرێکار بوو، ٧ هەزاریشیان قوتابی زانکۆ بوون و زیاتر لە ١٠٠ کەسیش نووسەرو ڕۆژنامەنووس بوون.

لە ژێر زەبری لولەی تفەنگی سەربازە سۆڤیەتییەکان دوا کۆنگرەی یەکێتی نووسەران بەسترا، لەگەڵ ئەو تۆقاندنەش یەکێتی بڕیاریدا بە ئاشکرایی کە هێزەکانی سۆڤیەت شۆڕشی خەڵکی هەنگاریای پێخوست کرد. هەروەها لەو بڕیارەدا هاتووە: لێرەدا لەبەردەم پاشماوەی وردوخاش بووی سور هەڵگەڕاوی بە خوێنی شۆڕشەکەمان لە پێناو سەربەستیدا، لە بەردەم ئاواتە بابردەڵەکانی سەرتاپای گەلێک، دەوەستین بۆ پێشکەش کردن وبژاردنی کردەوەکانمان ...

گەلەکەمان گەلێک ئەشکەنجەی چێژت، چونکە ئەو بیروڕایانەی کە گەلەکەمان باوەشی بۆ کردنەوە بەگەرمی و بەدڵسۆزی بەر لە دە ساڵ زۆر بە ڕێگایەکی دوژمن کارانەو داپلۆسێنەرانە هاتنە جێبەجێ کردن ...

گەلی ستەم دیدەمان بەتاسەوە دەیڕوانیە ژیانی سەربەخۆیی و نەتەوایەتی، هێزی هەڵقوڵاوی ئەو تاسەو ئارەزوە بوو کە دەرگای خستە سەر پشت بۆ شۆرشەکەی ٢٣ی تشرینی دووەم ساڵی ١٩٥٦.

جا ئێمە وەکو گەواهیدەرێکی ئەو ڕووداوە بە ئەرکی سەرشانی خۆمان دەزانین کە بڵێین حکومەتی سۆڤیەت هەڵەیەکی مێژوویی کرد، کاتێک شۆڕشەکەمانی لە خوێن گەوزاند.

سەرباری ئەوانەش دەبینین گیانی زیندوی شاعیرانمان و باوەڕمان بەدادپەروەری، دەمان گەیەنێتە ئەو باوەڕەی کەوا کاتی ئەوە دێت ئەوانەی هێزی خۆیان بە خراپی بەکارهێنا ڕۆژێک داوای لێبوردنمان لێبکەن.

داخوازیە سەرەکیەکانی هەنگاریا، بریتییە لە سەربەخۆیی نەتەوایەتی و بنیاتنانی ڕژێمێکی کۆمەلایەتی دیموکراسی. ئێمەی نووسەرانیش پیرۆزبایی لەو داوا ڕەوایانە دەکەین، ئێمە دەستی یارمەتی و هاریکاری درێژ دەکەین بۆ جوتیاران و کرێکاران و نەوەی

پێگەیشتوو پاش ئەوەی هاوئامانجی کردینی بەیەک، بە یارمەتی ئەوان پێویستە فەرمانڕەوایان تێبگەینین کە هەرگیز نابێت سیاسەت بۆ خۆی ببێتە ئامانج بەڵکو هۆیەکە بۆ هێنانەدی خۆش گوزەرانی گەل. هەر چەندە ئەو بڕیارە هەرگیز بڵاونەکرایەوە لە ڕۆژنامەگەری کۆمۆنیستیدا. بەڵام زۆر بەخێرایی بە هەموو لایەکی وڵات بڵاوبوەوە، هەروەها وەرگێڕدرایە سەر چەندین زمان و بەهەر چوار لای جیهانی چینی- سۆڤیەتی بڵاوکرایەوە.

وەڵامدانەوەی حکومەت بۆ ئەو داوایانە بریتیبوو لە داخستنی (ئرودالمی)و یەکێتی نووسەران، هەروەها سەدەها نووسەرو ڕۆشەنبیری خستە زیندانەوە، نووسەرانی هەموو وڵات ڕەتیان کردەوە دەستی یارمەتی درێژبکەن بۆ حکومەت لە بڵاوکردنەوەی درۆیە زلەکە کە دەڵێت:"چەند کەسێکی کەم لە فاشیستەکان ڕابەرایەتی ئەو یاخی بوونەیان کرد لە هەنگاریا بە فیتی بە کرێگیراوانی ئیمپریالیزم. ئەو کەمە کەسەی کە پێویستی بە چوار تیپ لەسوپای سۆڤیەتی بوو بۆ دامرکاندنی..

هەندێک لە نووسەران گاڵتەیان بە گوتەکانی حکومەت دەکرد ئەوەتا یەکێکیان دەنوسێ: ئەو چل هەزار قەشەو ئورستوکراتیەی کە لە کارگەکان سێپیلی پۆڵا کۆ ببونەوەو دوا دەستە بوون کە دەستیان لە بەرگری هەڵگرت.

لە ٢٠ی تەموزی ١٩٥٧ دادگای بۆ دابست فەرمانی لە سێدارەدانی دوو نووسەری (لاو جۆزیف جاڵی و جولیا ئۆبر چوفیسکی)ـدا لە سۆنگەی بەشدار بوونیان لە نووسینی درامایەک بە ناونیشانی (گردۆلکەی سەربەستی) کە باسی لە سێدارەدانی پیاوێکی بێتاوانی دەکرد. ئەم فەرمانە وێژدانی پێنوس بەدەستان و بیرمەندانی جیهانی هەژاند بروسکەی ناڕەزایی و داوای سوک کردنی فەرمانەکە بەلێشاو داباریە سەر (کادار)، سەرۆکوەزیرانی نوێی هەنگاریا، چەند نووسەرێکی جیهانی لە نێو ئەو کەسانە بوون کە بروسکەیان نارد لەوانەش: ئەلدۆس هێکسلی، گوڵ ڕۆماتۆس، ئەلپێر کامۆ، فرانسوا موریاک، جان پۆل سارتەر، ستیڤن سەندەر، بێرتراند رسل، پاپلو بیکاسۆ. حکومەتی هەنگاریا ناچار بوو حوکمەکە بۆ ١٥ ساڵ گیران سوک بکات. بەو شێوەیە شۆڕشی ویژدانی جیهان سەرکەوت لە ڕزگارکردنی ئەو دوو لاوە لە ژێر چڕنوکی مەرگ.

بەڵام سەدەهای تر هێشتا لە زیندانەکانی پۆلیسی نهێنی مەرگی هێواش دەنۆشن. لە هاوینی ١٩٥٧ چەند سەرکردەیەکی ژیانی ڕۆشنبیری لە هەنگاریا چوونە لای وەزیری ناوخۆی ئەو کاتەی هەنگاریا بەڕێز فێرس میونخ ، ئینجا ناڕەزایی خۆیان دەربڕی لە دژی زیندانی کردنی چاکترین نووسەرانی وڵات. هەر کە ئەوەیان گوت میونخ لە ڕەفەی نوسینگەی نامەیەکی ئەدیب و شاعیری پیرەمێرد

(زولتە زەلک)ـی دەرهێنا، کە تێیدا دووپاتی کردبۆوە کە شۆڕشی تشرینی دووەم شۆڕشێکی نیشتیمانی نەمر بوو بە پێچەوانەی ئەوانەی دەڵێن شۆڕشێکی کۆنەپەرستانەی چەواشەکەر بوو بە فیتی بێگانە هەڵگیرسا. دوایی وەزیر گوتی: "ئەمەش بەڵگەیەکی تەواوە کە ئەو ئەدیبە هیچ تەماو ئومێدی نەماوە".

ئەو شاعیرە بەرزە لە ٥ی ئایاری ١٩٥٦ لە گۆڤاری (ئرودالمی) شعرێکی نووسىبوو بەناونیشانی (چۆن ئازا دەبم) ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەو شیعرە:

**هاورێکەم من ئازا نیم**

**بڕوا بکەن مچورک**

**دەگاتە سەر ئێسقانم هەر کە ستایشی ئازایەتیم دەکەن**

**من پڵینگ نیم بەڵکو مرۆڤم**

**دڵم لانەو بێشەی**

**ترسەو بەس**

**بڕوام پێبکەن من دەترسم، دەترسم**

دەسەڵاتداران وا دیار بوو، پەندیان لە مەسەلەی لەسێدارەدانی دوو ئەدیبە لاوەکە وەرگرتبوو بۆیە ئەو جارە هەتا (غایور فولدز) یان لە سێدارە نەدا باسیان نەکرد. لە پاش ئەوە بە چەند مانگێک چەند ئەدیبێکی ناسراویان زیندانی کرد وەک (تایبور دری)، (غولیا های)، (زولتا زەلک)، (تایبور تاروس) بۆ ماوەی نێوان شەش مانگ تا شەش ساڵ.

لە ساڵی ١٩٥٨ کاتێک سەرۆکوەزیران (ئیمری ناجی)ـو ژەنەراڵ (بال هالیتەر) لە سێدارە دران، لەگەڵ ئەو دووانەش کۆمەنیستەکان (میکلوس غیمز)ـو ئەدیبی ناودار (جۆزیف سنرلاگی) و (ئیستیڤان بیبو) و (غیزا لوستری) چاپچیان لە سێدارەدان (غیزا و بیبو) دوو وەزیر بوون لە حکوموتی شۆڕشگێڕی ئیمری ناجی.

(ئیستیڤان بیبو) لە ساڵی ١٩٤٥ـوە بانگەوازی دەکرد بۆ ڕێبازی ئاشت بوونەوەو چارەسەرە ناوەندییەکان بۆ نەهێشتنی ناکۆکییە نێو دەوڵەتیەکان. ئەمەش چەند بڕگەیەک لەو یاداشتەی کە پێشکەشی کرد بە بەرپرسانی لە دوای نوشوستی شۆڕشی هەنگاریا کە تێیدا داوای چارەسەری ناوەندی کردبوو:"بارودۆخی ئێستای هەنگاریا چەپۆکێکە بۆ هەموو لایەنگرانی پەیڕەوکردنی سیاسەتی (ڕێگای سێیەم). ئەو دەوڵەت و کۆمەڵەو کەسانە...هتد و چەند دەوڵەتێکی ئاسیایی و هەموو حیزبە سۆشیالیست و سۆشیال

دیموکراتەکان و چەند کۆمەڵێکی سیاسی تر، هەموویان لەو باوەڕەدان کەوا جیهانێکی دوو بەش کراو لە نێوان بیروباوەڕی سەرمایەداری و بیروباوەڕی کۆمەنیستی، جیهانی دێوەزمەو خێوە بەگژیەکدا چووەکانە، جیهانی گیروگرفتە ساختەو دەسهەڵبەستەکانە، لەنێو ئەو دێوەزمەو خێوانە دەمارگیری لەلایەن سەرەڕۆکانی سەرمایەداری و کۆمەنیستی بەزەقترین شێوە بە دیار دەکەوێت....

لە ساڵی ١٩٥٨و١٩٥٩ ئەو ئەدیب و نووسەرانەی کە هێشتا فەرمانی قەدەغەکردنیان لە نووسین دەرنەچوو بوو، بەر لێشاوی تورەی حیزب کەوتن کە تاوانباری کردن بە مانگرتنی سەرتاسەری بێدەنگ، تۆقاندنیش سەر لە نوێ ڕوخساری دزێوی وەدیار کەوتەوە لە ئاکامدا (١٦٠ ئەدیب و نووسەر قەدەغەکران لە نووسین و بڵاوکردنەوەی هەر شتێک).

# ئەدەبی پۆڵۆنی

## لادان لە دارێژگەی دەق گرتوو

## مۆڵگەیەک لە ئیمپراتۆریەتی ستالین

پۆڵۆنیا بۆ ماوەی سەدد ساڵ -هەتا ساڵی ١٩٨١- لە ژێر زەبرو زەنگی ئەڵمانیاو ڕوسیاو نەمسا ژیا. ئەدیبانی ئەم گەلە ستەمدیدەو کوت و کوت کراوەو کۆیلەیە بوون، کە پارێزگاری مەشخەڵی بلێسەداری گەلیان کرد، هەتا کاتی سەربەستی هات. شاعیرانی وەکو (میکیو) و (کەز)و هاوچەشنی ئەوان بە ویژدانی (مێژوو) و (ڕۆڵەکانی سەربەستی) دادەنرێن لەو ڕابوونەدا.

هێشتا بیست ساڵ تێپەڕ نەببوو بەسەر ئەو سەربەستیە کاتێک هیتلەر پێشێلی کرد لە ژێر پۆستاڵی سەربازەکانی دا، هێشتا ئەو پۆستاڵە زەبەلاحانە لە سەر سنگی خاکی نیشتیمانی هەڵنەستا بوون، کە وڵات بووە مۆڵگەیەک لە ئیمپراتۆریەتی ستالین. بەو پێیە دیسان لە چارەنووسی ئەو وڵاتە نووسرابوو دووچاری ژێر چەپۆکی دوژمنە دێرینەکەی (ڕوسیا) ببێتەوە، کە دەستی کرد بە سەپاندنی بیروباوەڕی کۆمەنیستی بە زەبر وزەنگ و تۆقاندن.

دوژمنایەتی و ڕقی دێرینەی ڕوسیەکان پاڵنەرێک بوو بۆ سەپاندنی توندو تیژترین جۆری زۆرە ملێیی و چەوساندنەوە

بەسەر گەلی پۆلۆنیا. ئەوەش شتێکی چاوەڕوان کراو بوو هەتا کۆمەنیستەکانی پۆڵۆنیاش لە داگیرکردنی ستالینییەکان دەترسان. بەو شێوەیە دەبووایە فەرمانڕەوایان هەردەم لە کۆشش کردن یان بۆ دەمکوت کردن و مل پێ کەچ کردنی نووسەران و ئەدیبانی پۆڵۆنیا، هەروەها بۆ دابڕینیان لە ئەدەبی جیهانی و، بە تووتی کردنیان، یان بیان کەن بە شایەرو چاوەش هەردەم سرودی ستایش و پێهەڵگوتن بە بەژن و باڵای ڕابەرە کۆمەنیستەکان بڵێن و بیلێنەوە، بەڵام بەشی ئەو هەڵمەتەو کۆششە نوشوستی بوو، هەر چەندە لێرە ولەوێ هەندێک سەرکەوتنیان بە دەست هێنا.

## چۆن حیزب ئەدیبێکی گەورە دەفەوتێنێ

دەتوانین بیرۆکەیەک وەدەست بێنین دەربارەی ئەو تۆقاندنەی کە دەوری ئەدیب و نوسەرانی پۆلۆنیای دابوو، هەروەها ئەو فشارەی کە لە سەریان بوو لە رێگای مەسەلەی ئەدیبی ناوداری پۆلۆنیا (و.باک)، کە یەکێک بوو لە شاعیرە ناودارەکانی بزوتنەوەی بەرگری نهێنی (دژە کۆمەنیست) دژی سەردەمی نازی لە پۆڵۆنیا.

لە پاش کۆتای جەنگ (باک) بەشداری ژیانی سیاسی نەکرد هەر بە خەباتی بەرایی وازی هێنا، هێندەش کەیفی بە رژێمی کۆمەنیستی نەدەهات، کە هەموو هەوڵێکی نووسینی لێ قەدەغە کردبوو، باک داوای مۆڵەتی کرد بۆ سەفەرکردن بۆ ئیتاڵیا، وا دیار بوو دەوڵەت پێی شەرم بوو داوەیەکی ئاسایی وا رەت بکاتەوە بۆیە مۆڵەتیان پێدا، بەڵام پۆلیسی نهێنی رێیان پێگرت کاتێک هیچ شێوازێک لەگەڵی دادی نەدا لە قەدەغەکردن و تۆقاندنیدا، دەستوریان دایە یەکێتی نووسەران تا جارِی شێتایەتی ئەو پیاوە بدەن و داوایەک پێشکەش بکەن بە (پۆلیسی نهێنی) بۆ ئەوەی بیخاتە نەخۆشخانەی شێتان.

هەڵبەتە باک گیراو خستیانە نەخۆشخانەی شێتان، لەوێوەش بۆ زیندانی پۆلیسی نهێنی گوێزرایەوە، دوایی بە ناچاری ئازادیان کرد، پاش ئەوەی نەیانتوانی شێتبونی بسەلمێنن، یان تەنانەت

بەڵگەیەکی ساختەشی لە مەڕ هەڵبەستن. بەڵام هەر بەدوایەوە بوون تا گوتی:"ژیانم بۆتە مۆتەکەیەک هەرگیز بەرگەی ناگرم، ڕۆژ نییە بانگم نەکەن بۆ ئامادە بوون لە بەردەم پۆلیس، یان دادگا، یان دکتۆری نەخۆشییە عەقلیەکان، بەبێ هۆ، تەنیا ئەوە نەبێ کە دەیانەوێ بم فەوتێنن و لە ناوم بەرن".

ئەوەش نمونەیەکە لە شیعرەکانی ئەو ئەدیبە ستەمدیدەیە:

**ئەوانەی لە (تۆ)یان دا**

**کەوتنە گیانی منیش**

**ئەوانەی (تۆ)یان ڕیسواکرد**

**کەوتنە ڕیسوا کردنی منیش**

**دەزانی بۆ؟**

**چونکە هەناسەم بە سیەکانتا**

**دێت و دەچێ**

**چونکە خوێنم بە دەمارەکانتا**

**هەڵدەکشێ!**

دەنگیشمان بە یەک ئاواز بەرز دەبێتەوە

تورەیەکی چەموش لە ناخما پەنگ دەخواتەوە

لە شارو شارۆچکەکانی ئێرەش هەمان گڕ هەڵایساوە

هەمان تورەیی و خەشم و قین خۆی مەڵاس داوە

هاژەی دارو درەختەکان غەمگین بووە

شۆستەکان تاڵاوی خامۆشیان نۆشتوە

کاتێک دۆڕان بە دوای دۆڕا دێت

هیوام بەسەرکەوتنێکی دوور زیاتر بووە

ئەوانەی لە تۆیان دا

کەوتنە گیانی منیش

ئەوانەی تۆیان ڕیسوا کرد

کەوتنە ڕیسواکردنی منیش

ئەگەر هاتوو بەشەهیدی سەرت نایەوە

بێ بەشم مەکە لەو سەرکەوتنە

ڕۆژ بەڕۆژ سرودی تورەیی بەرز دەبێتەوە

قارەمانیم بە تاجە گوڵینەی سەرکەوتن دەڕازێتەوە

# پرسیارەکانی ئەندامێکی حیزب

ماوەی چەندین ساڵ لە تۆقاندندا، گزیرانی پۆلیس ئەوەی لە دەستیان هات کردیان بۆ سەپاندنی ڕێبازی ستالین بەسەر ئەدەبی پۆڵۆنی و بۆ خنکاندنی دەنگی ئەدەبی ئازاد.

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا چنگی گزیرانی پۆلیس گەلێک خاو نەببووەوە، کە ئەدەبی پۆڵۆنی بەجۆرێک بەدیار کەوتەوە هەموو جیهانی سەرسام کرد. هۆی سەرسام بونیشیان، تەنها لەبەر ئەو ئازایەتیە بێ وێنەیە نەبوو، کە ئەدیبان نیشانیاندا لە بەرەنگاربونەوەیان بەرووی ڕژێم و گزییرانی پۆلیس، بەڵکو بە هۆی ئەو دۆزینەوەیە سەیرو سەمەرەیە بوو، لە سروشتی گەلی پۆلۆنی کە ڕادەی بلیمەتی و زیپک و زاکۆنی هەرگیز کاری لێ نەکرا لەگەڵ ئەو فشارە لە ڕادە بەدەرەی کە داوێنگیری ببوو بە درێژایی چەندین ساڵ.

لە قۆناغی یەکەمی خاوبونەوەی چنگی ڕەشی کۆمەنیستی، ئەدیبەکان توانیان بەشێکی زۆری شاکارە ئەدەبیەکانیان لەسەر پاشماوەی دارو بەردی سەردەمی ستالین تۆمار بکەن.

بەو کارەشیان ڕێگایان خۆش کرد لە بەردەم والابوونی سیاسی و شۆڕشی سپی پۆڵەندی لە تشرینی دووەمی ١٩٦٥، هەروەها ماوەی والابوونیان بە هەل زانی بۆ پتەوکردن و دامەزراندنی

بنچینەیی هونەری بەرهەمەکانیان، چونکە چەندین ساڵ تێپەری لە نوسینیان بێ ئەوەی کەلەپوری ئەدەبی (کافکاو فراست و جویس) بچوکترین کاریگەری هەبێت لە سەریان بەڵام، هێندەی نەبرد ئەدەبی پۆڵەندی بۆ هەموو جیهانی سەلماند کە شان بەشانی ئەدەبی جیهانی ڕێ دەکات.

ئەو کتێبە تۆمارگەی ئەو هەموو کورتە چیرۆک و ڕۆمان و شعرو وتارە چاونەترس و بوێرانە نییە، کە لەو ماوەیەدا بەرهەم هاتن و ئازایەتی ئەدەبی پۆڵۆنیان سەلماند. بەڵکو تۆمارگەی مێژووی ئەو ڕاپەڕینەیە کە گەلی پۆڵەندی ئەنجامیدا لە دەستگیرکردنی یەکەم هەلدا. ئەمەی خوارەوەش نموونەیەکە لەو شیعرانە، لە نووسینی (لوکتور واروسنرلکسی) بەناونیشانی: (پرسیارەکانی ئەندامێکی حیزب)

**حیزب ڕوبارێکی خاوێنەو هەرگیز پیس نابێت**

**ئایا مانای ئەوەیە من پێویستم بە خۆشۆردن نییە؟!**

**حیزب گا بەردێکی مەزنە**

**ئایا من گەردێکی ئیفلیجی ناو تۆزو بام؟!**

**حیزب مێشکی ڕێکخەری چینەکەمانە**

**ئایا من ژێر کاسەی سەرم بەتاڵە؟!**

حیزب دەنگی کۆتاییە

ئایا من دەهۆڵێکی لەرزۆکی دڕاوم؟!

حیزب دەسەڵاتی باڵایە

ئایا منی کەوش دوور، لە سەرمە پرسیار لە حیزب بکەم

چۆن کەوش ساز بکەم؟!

ئایا منی ڕەزەوان، لە سەرمە پرسیار لە حیزب بکەم

چۆن بایەخ بە سێووخۆخەکانم بدەم؟!

ئایا منی مۆسیقا ژەن، لە سەرمە ئەو ئاوازانەی

لە کەللەم سەما دەکەن بۆ حیزب یان ڕاڤە کەم؟!

حیزب هەردەم لەسەر هەقە.

ئایا هەر یەکێک لەسەر لوتکەی قوللەی حیزب وەستا

ئەویش لەسەر هەقە ؟!

حیزب متمانەی ڕووتە.

ئایا دەبێ من خاین بم، هەر کە گومانم لە خۆم کرد؟!

شۆڕشی سپی پۆڵۆنیا بە چەند ڕۆژێک پێش شۆڕشی هەنگاریا کەوت. چونکە لەساڵی ١٩٥٤ (غوملکا)یان لە زیندان ئازاد کرد، کە یەکێک بوو لە ڕابەرانی کۆمەنیست و یەکێک بوو لە سەرکردەکانی بەرگری لە دژی نازییەکان، لە پاش چوار ساڵ زیندانی کردن (غوملکا) کرایە سکرتێری حیزبی کۆمەنیستی پۆڵەندی و یەکسەر لە ٢١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ جاڕی سیاسەتی خۆی دا لەدژی تۆقاندن و زۆرە ملێیی. لە ڕاستیدا یەکەم خۆپیشاندانی شۆڕشی هەنگاریا بۆ پشتگیری کردنی غوملکاو سیاسەتەکەی بوو لە پۆڵۆنیا.

لەلایەک ئەدیبانی پۆڵۆنیا وەک ئاوەڵانیتریان ماوەی خاوبونەوەی ستالینزمیان بە هەل زانی و وەبەریان هێنا، لەولایەوە هاوبەش بوون لەگەڵ ئەوانی تر، بەڵام بەووەوە جیابوون لە ئاوەڵانیتریان کە بەرگریەکی خوێناویان کرد لە دژی سەرلەنوێ گەڕانەوەی دەسەڵاتی حیزب بەسەر ئەدەب دا، پاش وێک هاتنەوەی شەپۆلی ستالینزم. تابڵێی دلێرانەو بوێرانە بەرگری هەموو هەوڵ و کۆششێکیان کرد بۆ سەندنەوەی سەربەستییە تازە وەدەست هاتووەکان، بەوەندەش نەوەستان بەڵکو ڕەخنەی توندو تیژیان ئاراستەی نووسەران و ئەدیبانی خودی سۆڤیەت کرد لەبەر دەستەپاچەیی و زەبوونیان، کارگەیشتە ئەو ڕادەیەی تەنانەت ڕەخنەیان ئاراستەی بارودۆخی ئەدەبی ناو ڕوسیاش کرد.

# بۆ ئەدیبانی بێ دەنگ و گوێ ڕادێر

ئەمەش نموونەیەکە لەو نوسینانە. ئەو نموونەیەش لە وتاری (ک.ت.توبلتز) وەرگیراوە، کە لەپاش سەردانێکی بۆ مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٧٥ نووسیویەتی:"ڕۆمانێکی (بوگودین)ـم دیت بە ناونیشانی (ئورستکراتەکان) لەسەر شانۆی مایکۆفسکی نمایش دەکرا. پاڵەوانەکانی ڕۆمانەکە سیخوڕو بەکرێگیراوانی پۆلیسی نهێنی بوون. ناوەڕۆکەکەشی کرداری بنیاتنانی (نەوەیەکی نوێ)بوو لە یەکێک لە سەربازگەکانی بێگاریدا. ئەو نمایشە لە دەرهێنانی بلیمەتی سۆڤیەتی (مایرهولد) بوو، کە یەکەم جار لە ساڵی ١٩٣٧ لەسەر شانۆ دەریهێنا. لە پاشان بە ساڵێک دەستگیر کرا، پاش دوو ساڵ زیندانی، لە سێدارە درا. لە ساڵی ١٩٥٦ جاری بێتاوانیان دا. ئەوەی مایەی سەر سوڕمانە کە هێشتا پۆلیسی نهێنی ڕۆمانی بنیاتنانی (نەوەیەکی نوێ) نمایش دەکات. چەند ئاواتە خواز بووم کارەساتی (مایر هۆلد)یان لە سەر شانۆ بنواندایە".

لە هەمان ژمارەی ئەو گۆڤارە، وتارێکی تری بڵاوکردبۆوە بەناونیشانی (بۆ ئەدبیە بێ دەنگ و گوێرادێرەکان) تێیدا هاتبوو:"بۆ چەند ساڵێک ماوەی (مارتینۆف)یان نەدا شیعرەکانی بڵاوبکاتەوە. بەڵام دەستی لە شیعر هۆنینەوە هەڵنەگرت بۆ خۆیی و بۆ برادەرەکانی دەینووسی. لەو ڕۆژەی کە تەمەنی گەیشتە پەنجا ساڵ، خوینەران و ئەدیب دۆستانی کۆڕێکیان بۆ سازکردو هێندەی

نەبرد لە هۆڵەکە دەرزیت هەڵدابایە بەر عەرز نەدەکەوت. بەو شێوەیە بەدیارکەوت کە شیعرەکانی مارتینۆف ئەگەر چی بڵاویش نەدەکرایەوە بەڵام دەگەیشتە گەل. هەمان شت بە گوێرەی بوریس باسترناک، ئەوەی هەستابا شیعرێکی ئەوی خوێندبایەوە ئەگەر وشەیەکی لە یادچوبا یەکسەر ئامادەبووان بۆیان تەواودەکردو بەبیریان دەهێنایەوە .

لە پۆڵۆنیا قەدەغەکردنی ڕۆژنامەی (بوبرستو) بووە هۆی خۆپێشاندانی گەورە. ئەو ڕۆژنامەیە دەمڕاستی خوێندکارانی زانکۆ و ئەدیبان و لاوان بوو. لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژنامەیە پێشڕەوی ڕۆژنامەگەری تر بوو، لە پاش هەرەسهێنانی ستالینزم، هەروەها سەرقافلەی ئەو بزوتنەوەیە بوو، کە بووە هۆی گەڕانەوەی (غوملکا) بۆ فەرمانڕەوایەتی. ئا لەو کاتەوە ئەو ڕۆژنامەیە بەردەوامە لەسەر پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕی سپی و بەگژدا چوونی ئەو هەوڵ و کۆششانەی کە حیزب دەیدات بۆ ژێر چەپۆک کردنی ئەدەب.

ئەو ڕووداوانە کە بوونە هۆی خۆپیشاندانە گەورەکان لەوەوە دەستی پێکرد کاتێک دەسەڵاتداران سەرنووسەری ڕۆژنامەی ناوبراویان ناچارکرد دەست لەکار هەڵگرێ و ڕۆژنامەکە لە دوو مانگی تەمموز و ئەیلولی ١٩٧٥ لە دەرچوون وەستا کاتێک ژمارەیەک لە ئەیلول دەرچوو دەسەڵاتداران گلیان دایەوە بەبیانوی

ئەوەی کە وروژێنەرو شۆڕش ئامێزە تا ئەو پەڕی شۆڕشگێڕایەتی. ژمارەکە دیسان نوسرایەوە بەڵام دەسەڵاتداران دیسان قەدەغەیان کرد. ژمارەکانی تشرینی یەکەمیش دووچاری هەمان چارەنوس بوون، ئەوەش بووە هۆی ئاشکراکردنی مەرامی دەسەڵاتداران لە داخستنی یەکجارەکی ڕۆژنامەکە. لەسەرەتادا نارەزایی دەستی پێکرد دوایی پەرەی سەند بۆ خۆپیشاندانی گەورە کە بەردەوام بوو بۆ چوار ڕۆژ لە فەدسۆفیاو دوایی پەلی هاوێشتە زۆربەی شارەکانی تر. پیاوانی پۆلیسیش هەڵیان کوتایە سەر خۆپیشاندەران بە کوتەک و گورزو بۆمبای فرمێسک هێن. خەڵکێکی زۆر بریندار بوون. حیزبیش بڕیاری دەرکردنی هەموو نووسەرانی ڕۆژنامەکەی دا لە ڕیزی خۆی.

## درۆ شێوەی مەرەکەبی چاپخانەی وەرگرتوە

ئەدیبانی پۆڵۆنیا ورەیان نەڕوخاو بڕیاریاندا ڕۆژنامەیەکی تر دەربکەن لە ژێر ناوی (ئوربە)، بەڵام دەسەڵاتداران ژمارەی یەکەمی ئەویشیان گلدایەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی چەند نووسەرێک دەست لە کاری حیزب بکێشنەوە. بگرەو بەردە بەردەوام بوو لە نێوان ئەدیبان و گزیرانی پۆلیس بە درێژای ساڵی ١٩٥٨. (ئەنتوان سلوینمسکی) سەرۆکی یەکێتی ئەدیبان لە پۆڵۆنیا بە ئاشکرایی ڕای خۆی دەربڕی دەربارەی ئەو کێشەو بێشەیە لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی شعرێک لە گۆڤاری (نواکلتشورا) لە ساڵی ١٩٥٨ کە کارتێکردنێکی گەورەی هەبوو، لەسەر تێکڕای جیهانی کۆمەنیستی:

**درۆ توخمی پێنجەمە**
**بۆتە مەرەکەبی چاپخانەکان**
**درۆ لەستوونەکانی ڕۆژنامە دەچۆڕێتەوە**
**بنمیچی ماڵەکان، قیری شەقامەکان دادەپۆشێت**
**وا دیارە هیچ شتێک نەگۆڕاوە**
**تەنیا روخساری فەرماندە نەبێت**
**کە خەندە شەکرێکی زیاد کردوە**

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ (ماریک هلاسکۆ) کە یەکێکە لە ناودارانی ئەدەبی لاوان و خاوەنی خەڵاتی ئەدەبیاتی وڵاتیش بوو، ڕای کردە ڕۆژئاوا، پاش ئەوەی دەسەڵاتدارانی پۆڵۆنیا پاسپۆرتەکەیان بۆ نوێ نەکردەوە کاتێ لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دابوو.

هەروەها لە مانگی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ یەکێتی نووسەران بڕیارێکیان دەرکرد، کە تێیدا بەتوندی ناڕەزایی خۆیان نیشان دا دژی چاودێری کردنی توندو تیژی، کە بووە هۆی قەدەغە کردنی نووسین لە سێ نووسەر. بڕیارەکە داوای لە گەل کردبوو، کە بەرگری بکەن لە سەربەستی دەربڕینی بیروڕادا. ئینجا (جاسترون)ی شاعیر دەربارەی بڕیارەکە بە تەوسەوە گوتی:"دەسەڵاتداران بە گلدانەوەی هەورە تریشقەکان ناوەستن، بەڵکە ئەو هەورانەش گلدەدەنەوە کە دەبنە هۆی هەورەتریشقەکان".

شتێکی ئاسایی بوو، کە دەسەڵاتداران هەڵمەتێکی توندو تیژ بکەنە سەر پۆڵۆنیا لە هەموو وڵاتە کۆمەنیستەکان و تاوانی کۆنەپەرستی و گەڕانەوەی ڕەوڕەوەی ئەدەب بۆ دواوەیان بدەنە پاڵ، فکتور روسلسکی بە ناوی هەموو ئەدیبان وەڵامی ئەو تاوانەی دایەوەو گوتی:"دەستەواژەی گەڕانەوەی ئەدەب بۆ دواوە ئەوە دەگەیەنێ کە داڕێژگەیەکی نەگۆڕو هەمیشەیی هەیە بۆ ئەدەب، لادان لەو داڕێژگەیەش سزادانی بە دواوەیە. ڕازی بوون بەو قسانە

واتە لەناوبردنی توانایی داهێنان. ئەوە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە تا ئەو ڕادەیەی ئەو تاوانانە بەلامەوە گرنگیەکی ئەوتۆی نیە. شت لە گۆڕان دایە، مەترسیەکی هەمیشەیی هەیە کە ئەو هەڵسەنگاندنە سەراوژێرانە ببنە یاسایەکی ڕووتی ئەدەب".

گۆڤاری ڕەسمی حیزبیش (تربیونا لودو) هێرشێکی گەورەی کردە سەر ئەدیبان و یەکێتیەکەیان و گوتی:" پاش ١٤ ساڵ لە حوکمڕانی گەل نەیان توانی شوێنێک داگیرکەن لەبەرەی کۆشش کردن لە پێناو بنچینە دانانی ڕژێمی نوێ".

**هەمان شتیش لە چیکسلۆفاکیاو بۆلگاریاو ڕۆمانیا ڕویدەدا**

ئەدەب لە چکسلۆفاکیاو بولگاریاو ڕۆمانیا بە دوای یەکێک دا دەگەڕێت ڕزگاری کات لە تەونی جاڵجاڵۆکە، گەل زەینی ڕوونە هەرگیز برینەکان لە یاد ناکات. لە بڕیاری لیژنەی ناوەندی حیزب لە حوزیرانی ساڵی ١٩٥٧ دا هاتووە:"ئەو مەسەلەیەی کە بووە هۆی مشتومڕ لە نێوان ئێمەو چەند نووسەرێک پوختەکەی لە سۆنگەی ڕوونکردنەوەی چەند مەسەلەیەکی سیاسی و ئایدۆلۆژی بوو، وەک مەسەلەی پەیوەندییان بە حیزبی کۆمەنیستی و سیاسەتەکەی، هەروەها پەیوەندیان بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو تێڕوانینیان بۆ چەمکی سەربەستی".

هۆی سەرەکی توڕەبوونی حیزب لە ئەدیبان ئەو جۆرە شیعرانە بوون: بۆ نموونە شیعری (فرانتسک نشفتال):

لە کۆنەوە جڕو جانەوەرە دڕندەکان

وڵات داگیر دەکەن دەم نادەم

دز و جەردەکان ئێسک و پەیکەری گەل

بەتاڵان دەبەن

بۆ بازرگانی پێکردن

فەرمانڕەواکانیش هەردەم مەعسومن

دوای دەبنە ملهوڕی ستەمکار

تاوانەکان لە کۆشک و تەلاریان هێلانە دەکەن

درۆکان لەسەر کورسیی‌یەکان

بۆ هەتا هەتایی چاولێک دەنێن

دەیانەوێ گەل بنوێ

تا وەک ئاژەڵ ڕاپێچی کەن

بەڵام گەل زەینی ڕوونە

هەرگیز زامەکانی لە یاد ناچن؟!

گەر چی گیانیش ئەمڕۆ بێدەنگ بێت

با دەنگی زورناکەیان بەرز بێتەوە!

با درۆو فریودان لە دەمیان بزەی بێ!

گەل هەر دەبێ لە چرنوکی کارەساتا،

ڕزگاری بێ و

(سەربەستی)یش بەشکۆمەندی

لەدایک بێ!

بەڵام لە ڕاستیدا کەس ناتوانێ بە بارودۆخی ئەمڕۆی ئەدەبی چیکی دڵخۆشکەر بێت. گەورەترین دەسکەوتی ئەدەبی چیکی لە ماوەی سەدەی ڕابردوو و سەرەتاکانی ئەو سەدەیەش بزواندنی ویژدان و ڕەخنەی بە هێزی کۆمەڵایەتی بنیات نەر بوو.

ئەو دوو شتەش دوو دەرمانی تاڵ بوون کە (زولا و ئەناتۆلی فرانس) بە فەرەنساییەکانیان پێشکەش کرد، (گۆگۆل و گۆرکێ)ش پێشکەشی ڕوسەکانیان کرد.

بۆیە هەست دەکەین ئێمە پێویستمان بە شاکارێکی ڕەخنەیی هەیە کە گوزارش لە بیروڕا و ئاوات و ئاکارو ڕەفتارو سروشتی چیکیەکان بکات لەو چل ساڵەی ڕابردوودا، ئەوەش چەند وەڵامێکە لە گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی چیکی بڵاوکرابویەوە. چەند پرسیارێک دەربارەی ئەدەبی چیکی لە سەردەمی کۆمەنیستیدا:

پ: بۆچی پەخشانی ئەدەبی هاوچەرخمان نەگەیشتۆتە ئاستی هونەری ساڵی ١٩٠٠ ؟!...
و: چەنکە کارە ئەدەبیەکان بە شێوەیەکی وشک وبێ گیان دێنە بەرهەم.. هەروەها بیرکردنەوەی زۆربەی ئەدیب و بیرمەندان بە کۆت و زنجیری کۆنکریتی لە ناوەوە بەستراوەتەوە، تەنانەت هەر هەوڵ و کۆششێک دەدرێ بۆ داهێنان و دروستکردن هەر لە لانکی خۆیدا دەکوژرێ و تیرۆر دەکرێ، بە چەند داڕێگەیەکی لەبەرکراو ووشک ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ.

ئەوەی کە زیانێکی زۆری لە ئەدەبدا لەو ماوەیە کورتەدا ئەو بیروڕایە ساویلکەو ساکارە بوو، کە دەیگوت ڕاستی و هەقیقەت هەمووی دۆزراوەتەوە. ئەوەی لەسەر ئەدیبانە تەنیا نووسینە دەربارەی ئەو هەقیقەت و ڕاستیانە.

## سەربەستی پلانێکی ڕۆژئاوایە دژی سەربازگەی سۆڤیەتی

لە بولگاریا بەر لە هەموو نمایش کردنێکی ڕۆمانی (ترس)ی (تیۆدۆر جینوف) یەکێک لە هونەرمەندان دەهاتە سەر شانۆ ئەم چەند دێرەی دەخوێندەوە:

**ڕابەرایەتیمان بکە ئەی حیزب، ڕابەرمان بە!**

**من ئامادەم قوربانی بە هەموو شتێک بدەم،**

**ڕەوانەم کە هەندەران، گەر دەتەوێ**

**لەو پەڕی دنیاوە بە دەنگتەوە دێم**

**من ڕۆڵەی تۆم ئەی حیزبەکەم**

**ئەگەر دەتەوێ، دەتوانی بم کەی بە وەزیر**

**بۆ ئەوی هەمووماڵێک بە تاجە گوڵینە بڕازێنمەوە**

**بمدەرێ، تەنیا پلە وپایەکم بدەرێ**

**چاکەکەت چەند بارو بار دەدەمەوە...**

شتێکی ڕوون و ئاشکراشە کە چڵکاو خۆرێکی حیزب ئەو دێرانەی نووسبوو نەک (جینوف) کە خۆی بەر لێشاوی

هێرشەکانی ڕۆژنامە حکومەتییەکان کەوتبوو. چونکە قارەمانی ڕۆمانەکە لە گفتوگۆیەک لەگەڵ بەکرێ گیراوێکی حیزب دەڵێت:

ئای کە تۆ شکستە نەفس و بێ فیزی

لەگەڵ هەندێک باش و ڕووخۆشی

بەسەر هەندێکیش چاکە دابەش دەکەی

بەسەر هەندێکیتر گۆرەوی نایلۆنی پاریسی دابەش دەکەی

ئای جاڵجاڵۆکەیەکی گەورە چاوی لێمانە!

بە بەخشە من و تۆ لە هەمان تەونی جاڵجاڵۆکەین

دەبا بەدوای ڕزگارکەرێک بگەڕێین

هەڵبەتە مەبەستی لە تەونی جاڵجاڵۆکەش لێژنەی ناوەندی بوو.

بەناوبانگترین چیرۆک لە ماوەی خاوبوونەوەی ستالینزم بەدیارکەوت لە بولگاریا چیرۆکی (مەسەلەیەکی بێ بەڵگە) بوو لە نووسینی (ئەهیل ماتۆف)، هەروەها چیرۆکی (خێزانی لاسکۆف) و چیرۆکی (نیستا کەمۆف) بوو کە باسی چەوساندنەوەی هەژاران دەکات بەدەست دەوڵەمەندان لەناو کۆمەڵگەی کۆمەنیستیدا.

حیزبی کۆمەنیستیش ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی تاوانبار کرد بە گەڕانەوە بەرەودواوە، هەروەها بە بوختان هەڵبەستنی کۆنەپەرستان لەدژی پێشکەوتن دا.

ستربانۆف، یەکێکبوو لە ڕابەرانی نووسەرە کۆمۆنیستیەکان لە بولگاریا جاڕی هەڵگەڕانەوەی لە کۆمەنیستیدا، کاتێک داوای تیوری دابڕاندنی هونەری کرد لە سیاسەتەکانی حیزب. چی نەمابوو حیزب لە حەژمەتا شێت و هار بێت بۆیە سەر لەنوێ دەستی کردە گرتن و هەڕەشەو گوڕەشە لێکردن و چاودێری کردن.

لەبەردەم ئەم کارانە نووسەران جاڕی مانگرتنێکی سەرتاسەری بێ دەنگیان دا. ڕۆژنامەی حیزب (بەرەی ئەدەب) وتارێکی دەربارەی ئەدیبە مانگرتوەکان نووسی تێدا گوتی:"مەسەلە مەسەلەی ئەدیب و نوسەرانی سەلبی و بەرزەفڕ نییە، بەڵکو مەسەلە مەسەلەی وەبەرهێنانی ئەو بێدەنگییەیە وەکو هۆیەک بۆ بەرهەڵستی کردنی بیروڕاکانی حیزب لە بواری ئەدەبدا. ئەو نووسەرانە هەمیشە بێ دەنگ نین، بە پێچەوانەوە لە خۆیان چەنەباز وزۆربڵێ تر نییە کاتێک لە سەکۆی تایبەتی خۆیانەوە قسە دەکەن".

لە کانوونی دووەمی ١٩٥٨ ئیتر حیزب سەبرو ئارامی لێ بڕاو ئەدیبانی تاوەنبار کرد بە گێڕانی پیلانێکی ڕۆژئاوایی دژی بەرەی

سۆڤیەتی لە ژێر پەردەی بانگەوازی کردن بۆ دروشمە فریودەرەکە: (سەربەستی نووسەر).

## حیزب بیرو هۆشی ئەدیبان پاوان دەکات

لە ڕۆمانیا، کە چەوساندنەوەی ڕوسی هەر لە سەرەتاوە لەو پەڕی تووندوتیژی دابوو، ئەدیب و نووسەرانی تاوانبار کرد بە (ڕاکردن)، ڕاکردن لە بابەتە سیاسییە کۆمەنیستییەکان بۆ بابەتە ئەندێشەییەکان، هەروەها تاوانباری کردن بە متەق لە خۆبڕین لە پاش کۆنفرانسی بیستەمی حیزب و ڕووداوەکانی شۆڕشی هەنگاریا لە ساڵی ١٩٥٦. کاتێک ئەدیبانی ڕۆمانیا لە بازنەی (بێدەنگی)یەکەیان دەرچوون، لە (ڕاکردن)، کە گەڕانەوە دەم و دەست هەڵوێستی هێرشیان گرتەبەر.

جا کاتێک ئەوەی پێیان بوو گوتیان، ئەو جارە حیزب تاوانباری کردن بە لادان و تەگەرە نانەوە بە مەبەستی ئیفلیج کردنی حیزب و کارەکانی. هەتا ڕۆژنامەکانی هەنگاریاو ئەڵمانیاش لە خەشم و قینی حیزب ڕزگاری نەبوو، چونکە دەهۆڵیان بۆ بیروباوەڕی زیان بەخش لێدەدا.

بەڵام ئەم هەموو شتانە ئەدیبانی نەپریگاندەوە لە بەردەوام بوون لە جەنگ گێڕان دژی ئاراستەکردنی حیزب و پاوانکردنی بیرو هۆشی ئەدیبان، ئینجا (تودو ئەرگازین) کە مەزنترین شاعیری سەرتاسەری مێژووی ڕۆمانیا بوو، سیمینارێکی خوێندەوە تێیدا ستایشی (سانت ئوگستین)ی کردو وەسفی کرد بە ڕۆشنبیرێکی مەزن، هەروەها گوتی: من زۆر دەترسم لەو کەسانەی کە بە درێژایی ژیانیان لە کتێبێک زیاتریان نەخوێندۆتەوە.

ئەو قسەیەش ئاماژەیەکی پەنهانی تێدابوو بۆ گزیرە نیمچە ڕۆشنبیرکانی پۆلیسی سیاسی.

# لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات

## دابەزینێکی سامناک لە ئاستی بەرهەم هێنانی ئەدەبی و هونەری ڕژێمە کۆمەنیستیەکان بەرگری ئاڵ و گۆڕی ڕۆشنبیری ئازاد ناگرن

هەوڵی سەپاندنی دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری بەسەر ئەدەب لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لە بارودۆخێک بەڕێوەچوو ئەنجامەکانی تیشکێکی تایبەتی دەخاتە سەر بابەتەکەمان.

ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات-یان ئەڵمانیای دیموکراتی، هەروەک کۆمەنیستەکان ناوی دەبەن، سێیەکی نەتەوەی ئەڵمانیای بەش بەش کراو پێکدێنێت. بەپێچەوانەی وڵاتەکانی تری ژێر چەپۆکی کۆمەنیستی، ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بەتەواوی لە جیهانی دەرەوە دانەبڕابوو، چونکە لە ڕێگای بەرلین پایتەختی دوو لەت کراودا سێیەکی لاوانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات توانیان ڕابکەن بۆ کەرتی ڕۆژئاوا. بۆیە ڕژێمی کۆمەنیستی کەم و کورتییەکی زۆری هەبوو لە ژمارەی خوێندکارانی زانکۆ و مامۆستایانی، هەروەها هەمان گیروگرفتی هەبوو لە ژمارەی پزیشک و مامۆستاو ئەندازیار و نووسەرو هونەرمەندان.

جا لە سۆنگەی ئەوەی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بە تەواوی دانەبڕابوو لە کەرتی ڕۆژئاوا، هەروەها لەبەر نەبوونی بەربەستی

زمانەوانی لە نێوانیاندا، ڕژێمی کۆمەنیستی هەردەم لە ژێر کارتێکردنی بارودۆخی ڕۆشنبیری ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا بوو.

کۆمەنیستەکان ئەوەی لە توانایان دابوو کردیان بۆ سنوردارکردنی پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەکان لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا، بەڵام بەو کارەیان کۆمەنیستەکان سەلماندیان کەوا لەوە لاوازترن بەرگەی ئاڵوگۆڕکردنی ڕۆشنبیری ئازاد بگرن لەگەڵ وڵاتانی تری جیهاندا.

هەڵو مەرجی نووسەران و هونەرمەندان لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لە خاڵێکی گرنگدا جیایە لەگەڵ ئاوەڵانیان لە وڵاتەکانی تری کۆمەنیستدا، چونکە لە ڕاستیدا سەربەست بوون لە هەڵبژاردنی یەکێک لە دوو کەرتەکان. جا هیچ بیانویەکیان نەبوو بۆ گومان کردن لە دڵسۆزیەتی و سەر ڕاستی ئەو ئەدیبانەی کە مانەوەیان هەڵبژارد لە کەرتی دیموکراتی بۆ بەشداریکردن لە سەرلەنوێ بنیات نانەوەی وزەی گەل و هەوڵی چارەسەرکردنی کۆمەنیستی، بەڵام زۆربەیان بەشیان زیندان و دورخستنەوە بوو.

لەسەردەمی نازیەکان لە ئەڵمانیا ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرە چەپڕەوەکان هەنگاویان نا بەرەوکۆمەنیستی یان بوونە هەڤاڵانی ڕێگا. لە نووسینەکانی ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبانی وەکو (بیرتهولد بریخت) و (ئانا سیفرز) و (ویلی بریدل) و (بیرنهارد کیلەرمان) و

(هانزڤالد) و گەلێکیتر مرۆڤ دەتوانێ سەرنجی ئاراستەکردنی حیزبی تێدا بەدی بکات.

# هەرەسهێنانێکی گشتی لەکارە ئەدەبیەکان

ئەگەر بەراوردی ئەو کتێبانەی (ئانا سیفرز ویلی بریدیل) بکەین، ئەوانەی بەر لە سەپاندنی دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری بەسەر ئەدەب نووسراون لەگەڵ ئەوانەی لە پاش سەپاندنی دیکتاتۆریەت نووسراون، دەبینین لە بەرهەمەکانی یەکەم هەست بە تەزو موچرکی خۆش و سۆزی شۆڕشگێڕی و گەشبینی مرۆڤایەتی دەکەیت، بەڵام ئەو بەهایە جوان و بەرزانەی هەر بەتەواوی ون بوونە لە بەرهەمەکانی دووەم کە نووسەر بەپێی ئاراستەکردنی حیزب نووسیویەتی.

ئەگەر چاو بەنووسینەکانی (برێت) بخشێنین هەتا ئەوانەی لە پاش ١٩٤٥وە نووسراون، بەلایەنی کەمەوە ئەوانی رێی چاپکردنیان پێدرا بوو، دەبینین بیروبڕوای راستگۆیانەی تێدا نییە، هەتا نووسەرانی کۆمەنیستیش ئەو بیروڕایەی پسپۆرانی ئەدەبیاتی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتیان دەسەلماند، بەڵکو هەندێک لە ئەندامانی حیزبی کۆمەنیستیش لەسەر ئەو رایەبوون .

شاعیرێکی وەک (جوهان بیخەر) ئەو رۆژە وەک شاعیرێک مرد، کە دەستی کردە شعر هۆنینەوە لە ژێر سایەی دیکتاتۆریەتی رێبازی کۆمەنیست. کەسانێک لەگەڵ نابەڵەدیان بە هونەرو ئەدەب بە هەموو توانایانەوە هەوڵیان دەدا ئەدەب و هونەر کۆت و زنجیرکەن

و ملی پێ کەچ کەن بۆ ویست و ئارەزووی خۆیان، لە ڕێگای سەپاندنی سروشتی پڕوپاگەندەی بەسەر نێوەڕۆکی نووسینەکاندا، هەروەها سەپاندنی شێوازێکی سادەو ساویلکەی وەها کە چەشەی سەرەتاییان تێر بکات. ئەوەشی بە موو لایدابا لە دروشمەکانی مارکسیسزم زۆر بێ شەرمانە پەڵەی بورژوازی چەپەڵیان بە نێو چەوانی وەدەنا.

پرۆفیسۆرو مێژوونووسی ئەدەب (هانز مایەر) لەو دوو سیمینارەی دەربارەی بابەتی ئەدەب لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات خوێندنەوەی، بەراوردێکی کرد لە نێوان دەوڵەمەندی و قوڵی ئەو بەهرە بەرزانەی کە بەدیار کەوتن لە نێوان ساڵی ١٩١٤ و ساڵی ١٩٣٣ و لە نێوان ئەو بێ ئاستییەو لاوازییە ئاشکرایەی بارودۆخی ئەدەبی هاوچەرخی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات.

هەروەها بەتوندی دابەزییە سەر ئەو تیۆرە ستالینیەی کە دەڵێت ئەدیبان ئەندازیاری گیانی مرۆڤن و گوتی:"گەلێک دژوارو ئەستەمە زانستە تەکنەلۆژییەکان بەراورد بکەین بە کارە ئەدەبییەکان، چونکە ئەندازیار ناتوانێ بە هەوەسی خۆی دەست تێوەرداتە گیانی مرۆڤایەتی ".

هۆی لاوازی و بێ کرۆکی ئەدەبی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی گەڕاندەوە بۆ نوشوستی لە چارەسەرکردنی هونەریدا سەربەخۆو جیا لە زانست و سیاسەت.

ئینجا داوای سەربەستی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کرد لە ئەدەبی هاوچەرخدا، جا ئەو ئەدەبە بورژوازی بێت یان نا، هەروەها دووپاتی کردەوە لەسەر ماوەدان بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی ئەدەبی بە فراوانترین شێوە.

هەروەها گوتی: "پێویستە لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی کافکا بە کارێکی نهێنی و بەتەنیا لە تاریکی ئەنجام نەدرێت، هەروەها پێویستە بایەخ دان بە فولکزا یان بە ویلدەر بە کارێکی لادەرانە و ناشەرعیانە دانەنرێ".

لە ئاکامدا پرۆفیسۆر مایەر بە توندترین شێوە سەرزەنشت کرا لە سۆنگەی تیۆرەکانی، بەڵام سەرنووسەری گۆڤاری (ئەدەبی ئەڵمانیای نوێ) باسکی هەڵکرد بۆ بەرگری کردن لە پرۆفیسۆر، گوتی کەس لە ئێمەی ڕۆژنامەنووسانی گۆڤارە ئەدەبیەکان لە پرۆفیسۆر مایەر چاکتر نازانێت کە ئێمە لە ساڵانێکی نەهات و نابوت دا دەژین، جا کاتێک مێژوو نووسێکی ئەدەبی پەنجە دەخاتە سەر برینەکان و هۆیەکان ئاشکرا دەکات، پێویستە بەڕێزەوە پێشوازی لێ بکرێت نەک بە سەرزەنشت کردن و گاڵتە پێکردن.

## شاکارە هونەریەکان توشی نەزۆکییەکی تەواو هاتوون

ئەڵمانیا لە پێش سەردەمی هیتلەر بە ڕابەری جیهانی شانۆ و نواندن دەژمێردرا، درامانووسان و دەرهێنەران و بەرپرسانی جل و بەرگ لە چڵە پۆپەی هونەریدا بوون. ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەیتوانی پشت بەو پاشماوەو کەلەپورە ببەستێ، بە تایبەتی لەگەڵ بوونی مامۆستای کارامەی گەروەو بەرزی وەک برێخت و گەلێکیتر لە درامانووسە کۆمەنیستەکان ئەگەر هاتباو بە ئاراستە کردنەکانی حیزب دەست نەخرابایە نێو کاروبارەکانیان.

گۆڤاری (شانۆ) کە حیزبی کۆمەنیست دەری دەکرد، لە ژمارەی ئازاری ساڵی ١٩٥٧ گوتی: "چل شانۆگەری لە سەرجەمی شێست و چوار شانۆگەری لە یەک جار زیاتر نمایش نەکران لەبەر ئەو بێ ئیقبالیەی کە بەخۆیانەوە دیت، ئەوانی تریش لەبارترینیان لە پێنج جار زیاتر نمایش نەکران".

ئینجا گۆڤارەکە گلەیی دەکرد لە دەست ئەو بایەخە زۆرەی کە ئەدیبان دەیاندا بەدراماو چیرۆک و ڕۆمان نووسانی ڕۆژئاوایی وەکو سامۆیل پێکت و کوکتو و جید و فولکنەر، لە جیاتی ئەوەی هانی ئەدیبە تازە پێگەیشتووەکانی وڵات بدەن. ئەو سکاڵاو گلەییە کە لە ناوەڕۆکەوە ئاماژەی بۆ دەستەی هونەرمەندانی شانۆ و ڕابەرانی دەکرد کاری لەهیچ یەکێک نەکرد، بە تایبەتی ئەگەر بزانین وەزارەتی ڕۆشنبیری ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، هەردەم لە نێوان بەرزو

نزم و گرژبوون و والابوون دا بوو. ئەو بارودۆخەش بووە هۆی ڕێکخستنی زنجیرەیەک لە خۆپیشاندان و پشێوی لە بەرلینی ڕۆژهەڵات و چەند شارو ناوچەیەکی تر، لە دواییدا فشاری ئەو بارودۆخە ناچاری کردن سیاسەتێکی نوێ بگرنەبەر.

گۆڤاری(کالتشر بوند)یش لە حوزەیرانی ١٩٥٣ دا نوسیبوی:"ڕۆشنبیران کۆشش دەکەن لە پێناو بەدیهێنانی سەربەستی بیروڕا لە هەموو بوارێکی لێکۆڵینەوە زانستی و ئەدەبییەکان، دەست تێوەردان و خۆتێ هەڵقورتاندن دەسەلاتدارانی وڵات پێویستە دەمودەست ڕابگیرێت، پێویستە ڕۆژنامەگەری و ئێزگەکان ئەو ڕاستیەیان لێ ون نەبێت کە جەماوەر هەردەم ئاگاداری هەواڵ و زانراوە ڕاستەکانە".

لە پاش چوار ڕۆژ ئەکادیمیای هونەرەکان لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات پێشنیارێکی شۆڕشگێڕانەیان خستە ڕووی حکومەت تێیدا داوایان لە حکومەت کرد ڕاوێژ بە ئەوان بکات بەر لەوەی هەر یاسایەکی پەیوەندار بە ئەدەب و هونەر دەربکات.

(جروتهول)ی سەرەک وەزیرانیش لە وتارێکیدا لە بەردەم لیژنەیەکی ناوەندی پەیمانیدا بە لابردنی (هەندێک کۆسپ و تەگەرە لە بەردەم داهێنانی ئەدەبی و هونەری و پەیمانیدا کە لە ئایندەیەکی نزیکدا ئەو کۆسپ تەگەرانە نەمێنن) ئنجا دانی

پێداهێناو گوتی:" داهێنانی هونەری ئەوەندە بە خێرایی لەتەوەرەی حیزب و دەوڵەت دەخولێتەوە تا ئەو ڕادەیەی تووشی نەزۆکیەکی تەواوی کردوە".

هەروەها بەڵێنیشیدا کە سنورێک دابنێت بۆ ئەو ڕفتارە ناحەزو دزێوانەی کە لە هەندێک ئەندامانی حیزب و بەرپرسان دەردەچێت لە دژی هونەرمەندان و بەرهەمەکانیان.

بەڵام هێشتا زایەڵەی ئەو بەڵێنانەی لە گوێی خەڵک زرینگەی دەدایەوە کاتێک لێپرسراوان بەڵێنەکانیان لە بیرەخۆ بردەوە لە پاش ئەوەی پشێوی و شلەژان کەمێک هێدی بوونەوە. لە ١٩ی تشرینی یەکەم هەر (جروتهول) بڕیاریدا :"دەوڵەتەکەمان ناتوانێ دەست لەمافی ئاراستەکردنی ئەدەب و هونەر هەڵگرێت".

# ئاڵای حیزب لەسەرەوەی ئاڵای ڕۆشنبیری و هونەرە

کاردانەوەی هونەرمەندان گەلێک توندوتیژ بوو، هەتا کۆنفرانسی چوارەمی نووسەران، کە بڕیاربوو لە ئایاری ساڵی ١٩٥٤ ببەسترێت، بە فەرمانی دەسەڵاتداران دواخرا بۆ سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٦. لە ساڵی ١٩٥٥ دکتۆر (ویلهەم جیرنوس) کە ئەندامێکی باڵای حیزب بوو هێرشی بردە سەر(واڵتەر فیکتۆری) نووسەر چونکە گوتبووی:"بەهرەو بلیمەتی زگماکی نووسەر لە داهێنانی ئەدەبیدا ڕۆلێکی باڵاتر دەگێڕێت لە ئیلتیزامی ئایدیۆلۆژی".

(دکتور جرینوس) لای وابوو کە ڕوونی ئایدیۆلۆژی و باوەڕ بە ڕێباز دوو هۆی هەرە گەورەو سەرەکین لە بڕیاری هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی سۆشیالیستی.

لە کۆنفرانسی چوارەم بریدل کە کۆمەنیستێکی کۆن و لە نووسەرە بەرایەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بوو، لە (جرینۆس) هاتە دەنگ و گوتی:"ئایا دکتۆر جرینۆس وادەزانێ ئێمە هەر کە ئەو قسانەمان گوێ لێ بوو دەسبەجێ ڕێگاو رووگەمان دەگۆڕین، بە دڵێکی پڕ لە جۆش و خرۆشەوە دەپەرژێینە سەر کارە نوێیەکانمان؟! ئەوە چۆن ڕفتارێکە؟! حەزدەکەم بزانم بە چ هەقێک ئەو جۆرە قسانە دەکرێ و دەنووسرێ؟!".

پاش دوو ڕۆژ لە تەواوبوونی دانیشتنەکانی کۆنفرانسەکە (لودیگ وین) چیرۆک نووسی ناوداری حیزب وەڵامی حیزبی بڵاوکردەوەو تێیدا بڕیاری حیزبی دوو پاتکردەوە لە ئەدیبان و هونەرمەندان بە پێویستی توێژنەوەی مارکسیزم و لینینزم سەر لە نوێ بە قووڵی و بەوردی. لە کۆتایی دا گوتی: "ئەگەر والتەر ڤیکتۆر ئاڵای هونەری بەرز کردبێتەوە ئێمەش مافی ئەوەمان هەیە ئاڵای حیزب لە سەرەوەی ئاڵای هونەر بەرز بکەینەوە بەڵکو دەبێت ئاڵای حیزب لە سەرووی هەموو شتێکی تر بێت".

لە پاش کۆنفرانسی بیستەمی حیزبی کۆمەنیستی سۆڤیەتی ماوەی واڵابوونی دووەم دەستی پێکرد، ئەو ماوەیە بە جۆشان و تەقینەوەی جەماوەری لە گشت کەین و بەینی جیهانی کۆمەنیستی دەناسرێتەوە، نووسەرانی ئەڵمانیا هەوڵیاندا ئەو پەڕی سوود وەرگرن لەو دەرفەتە، بیروڕای بوێرانەو نووسینی ئازاد بەدیار کەوتن بەجۆرێک ئەدیبان لە پاش شۆڕشی سپی پۆڵۆنیاو شۆڕشی خوێناوی هەنگاریا ببونە مایەی ناڕەحەتی و دڵەڕاوکێی پۆلیسی سیاسی کە بەو بارودۆخە هەراسان ببوون. لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٦ دا پرۆفیسۆر( وۆلف غانگ هایخ) سەرنووسەری گۆڤاری (فەلسەفەی ئەڵمانی) گیرا بە تاوانی پیلان گێڕان بۆ سەرنگوم کردنی ڕژێمی فەرمانڕەوایی. لە پاش ئەو گرتنە بە ماوەیەکی کەم ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب و ڕۆژنامەنوس و چاپکەر و

خوێندکارانی زانکۆ گیران. هەروەها (مارتین بوچەر)یش لە سەرنوسەری رۆژنامەی (فوشین پۆست)دەرکرا بە تاوانی بڵاوکردنەوەی وتاری (غوملکا) بەسەر ئەندامانی حیزبی کۆمەنیستی پۆلەندی. ئینجا پرۆفیسۆر(هاریج) لە زیندان یاداشتێکی ئامادەکردو ویستی بیگەیەنێتە لێژنەی حیزب، هەروەها دانەیەکی رەوانەکردە باڵوێزخانەی سۆڤیەتی لە ئاکامدا دە ساڵ زیندانیان کردە کاڵای باڵای، ئەمەش چەند برگەیەکی ئەو یاداشتەیە :"ئێمە نامانەوێت نکۆڵی بکەین لە مارکسیسزم و لینینزم، بەڵکو دەمانەوێت ئازادی بکەین لە کۆت و بەندی ستالینزم. ئێمە دەمانەوێ بە رێگایەکی رەواو شەرعی بیروراکانمان لە ناو حیزب بهێنینە دی، بەڵام رەوای کارەکانمان دەگاتە چلەپۆپەی کاتێک سەرکردایەتی ئێستای حیزب بە رێگایەکی نارەوا رەفتارمان لەگەڵدا بکات...لێکۆڵینەوەو توێژنەوە لە ناو حیزب بە تەواوی خنکێنراون هەروەک چۆن رۆژنامەگەری خنکێنرا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نابووتییەی کە چینی کرێکاران دووچاری هاتووە بە ئەنجامی پیلانەکانی بەکرێگیراوانی ئیمپریالیزم لێکدەدرێتەوە. ئێمە دەمانەوێ لە ناوەوە چارەسەری گیروگرفتەکانی حیزب بکەین. پێویستە دەست بەسەرداگرتنی ئەندامانی حیزب لە رێگای دام و دەزگای حیزبەوە نەمێنێ. هەروەها مەترسی هەڵگیرسانی شۆرشی جەماوەری لە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی هەر لە گۆرێ دایە

ئەگەر بێتو ستالینییەکان هەر لە لوتکەی دەسەڵتداریەتی بمێننەوە".

تاوانی هاریخ ئەوەندە بوو، کە بە سەربەستی ڕێنموییەکانی کۆنفرانسی بیستەمی حیزب لێکدایەوە کە لە مۆسکۆ بەسترا بۆ بەرفراوان کردنی دیموکراتی و لەناو بردنی بەستەڵەکی دۆگماتیکی.

پرۆفیسۆری هەنگاری جۆرج لۆکاش ناودارترین ئەدیبی مارکسی بوو لە جیهانی کۆمەنیستی، هەروەها یەکێک بوو لە ڕابەرانی شۆڕشی بەلشەفی هەنگاری لە ساڵی ١٩١٩، هەروەها ئامادەی چەندەها کۆنفرانس و کۆبوونەوەی نێودەوڵەتی ئەدیبان و ڕۆشنبیران بووە لە یەکێتی سۆڤیەت، شاکارە هونەرییە بەرزەکانی لەلایەن ڕابەرایەتی کۆمەنیستی پەسەند کرابوو. هەتا دەسەڵاتدارانیش لە ئەڵمانیای دیموکراتی هانی نووسەرانیان دەدا بۆ خوێندنەوەی دانراوەکانی، بەڵام تەنها لەبەر بەشداری کردنی چەند شاگردو ئەدەب دۆستانی لە شۆڕشی هەنگاریا دەسەڵاتداران داوایان لە نووسەران کرد (خۆیان لە بیروڕا زیان بەخشەکانی لۆکاش دورە پەرێز بگرن).

لە ساڵی ١٩٥٧ سەردەمی فشارو زۆرەملێیی سەرلەنوێ گەڕایەوە، کە وای لە ئەدیبانی ئەڵمانیا کرد، بە تەواوی متەق لە خۆیان ببڕن و بێدەنگ بن، ڕەخنەگرتنی ئاشکراش باوی نەما.

ئەدیبانیش لە دانیشتنە ڕەسمیەکانیاندا تەنها چەند بڕیارێکی سادەو ڕووکەشیان دەردەهێنا بۆ لایەنگری کردنی حیزب، بەڵام (ئولبرێخت) هێزی لەبەر برا، هێندەی هانی نووسەران بدات و لێیان بپارێتەوە تا بنووسن و بەرهەم بێنن، بەڵام کەس گوێی پێ نەدا. ئەو مانگرتنە لە نووسین و قسەکردن دا بووە هۆی هێنانەکایەوەی ماوەیەکی کورتی واڵابون، بەڵام جەنگی گوریس کێشەکێ هەر بە توندی بەردەوام بوو لە نێوان نووسەرو گزیری پۆلیسدا.

## ئەدیبانی چین دووچاری دڕندەترین هەڵمەتی ڕق و ڕیسواکردن دێن

## شێوازی چینی ستالینزم

لەگەڵ دوایی هاتنی هەڵمەتی سوپایی ساڵی ١٩٤٩ گزیرە پۆلیسەکانی "ماوتسی تونگ" کەوتنە خۆ بۆ بەکۆمەنیست کردنی گەلی چین لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا. بڕیارو ڕاپۆرتەکانی حیزبی کۆمەنیست دووپاتی دەکەنەوە کەوا پاکسازیکردنی لاشەیی چینە نەیارەکان و ڕۆشنبیرەکان بەزەبرو زەگتربوون لەوەی لە ڕوسیاو ڕۆمانیا ئەنجام درا. ئەوانەشی کە مابوون شێوازی چینی ستالینزمیان گرتەبەر بۆ بە کۆمەنیست کردنیان. ئەو هەڵمەتە پاکسازیانە بۆ سەر پێ سپاردن و مل پێکەچ کردنی نەیارانی شۆڕش بە هوراکێشان و بەزم و شایی پێشوازی لێ دەکرا لە لایەن ڕابەرو سەرکردەکانی حیزب.

بە پێی بیروڕای (لوجیشینگ: سەرۆکی پۆلیسی نهێنی) بەرگری کردنی کۆمەنیستی بە چەکی پیاوە چەتەکان ئەنجام نادرێ بەڵکو لە دڵی ملیۆنەها ئەنجام دەدرێ، بۆیە دروشمی (دڵەکان بدەن بەدەستەوە)ی داهێنا لە جیاتی چەکەکانیان بدەن بەدەستەوە. هەروەها گوتی: "نەیارانی شۆڕش دوو ڕێگایان لەبەردەم دایە: ڕێگای مردن بۆ ئەوانەی بەرگری دەکەن. دووەمیان ڕێگای ژیان بۆ ئەوانەی دان بەتاوانیان دەنێن. دانپیاهێنانیش چاکترە لە نکوڵی لێکردن".

(هان سوین) لە یەکێک لە چیرۆکەکانی باسی هەڵەکانی پاکسازی لاشەیی دەکات و دەڵێت:"... دەهۆڵەکان دەنگ دەدەنەوە، بڵندگۆکان زایەڵەی دێت، دروشمە فریودەرەکانیش دارو دیواریان داگیر کردبوە، بەجۆرێک ئەو شتانە بونەتە ڕۆتینێکی ڕۆژانە. لە شەنگەهای پۆلیس ناچار بوو بەدرێژی ڕۆخی ڕوبار پەرژین دانێن بۆ قەدەغەکردنی خەڵک لە خۆکوژی، هەتا وای لێهاتبوو خەڵکی دەترسان لە دەوروبەری ساختمانە بەرزەکان هاتوچۆبکەن لە ترسی ئەوەی نەوەکا لاشەی خۆکوژانیان بەسەردا بەربێتەوە".

پیاوانی پۆلیسی ماو گەلێک سەرکەوتوو بوون لە دەوڵەمەنکردنی زمان بە دەستەواژەی نوێی وەک (دەماغ شۆردن) (ئاراستەکردنی بیروڕاکان) (کلک بڕینی بەهایە کۆنەکان) (ئاکاری ناحیزبیانە)...هتد. بەو شێوەیە تۆقاندن چینی کردە سەربازگەیەکی پۆلیسی مەزن، تێیدا خەڵکی بە ئەشکەنجەدانی لاشەیی و دەروونی ناچاردەکران بۆ دانپێداهێنان. بەو شێوەیە دەبوایە گەلی چین (کلکی بەها کۆنەکانیان ببڕن) کە ڕەگی دەگەیشتە سەردەمە دێرینەکان، هەروەها دەبوایە خۆشیان ڕزگار بکەن لە شێوازی کلاسیکی ژیان و نکوڵیان کردبایە لە سروشت و ڕۆشنبیری نەتەوایەتی خۆیان، بە کورتی دەبوایە ببن بە گەلێکی کۆیلەو هەردەم دەست لەسەر سنگ بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئاغا ستەمکارەکانی حیزبی کۆمەنیستی ..

ماوتسی تونگ و دەستەو دایەرەکەی ویستیان لە ماوەیەکی کورت ئەو گۆڕانکاریانەی لە سۆڤیەت ئەنجام دران بەسەر چینی بسەپێنن، ئایا تۆ بڵێی لەبەر فراوانی خاک و زۆری ژمارەی دانیشتوان بوو ویستیان چین بکەن بە کۆمەنیستی؟ یان مەبەستیان لەناو بردنی یەکێک لە دێرینترین و بەرزترین شارستانێتی مرۆڤایەتی بوو؟ یان ویستیان پەکین بکەنە پایتەختی جیهانی کۆمەنیستانی ئاسیا بەلایەنی کەمەوە؟ تێ ناگەین.

ستەمکارانی سۆڤیەت ١٦ ساڵیان پێچوو بۆ دامەزراندنی دیکتاتۆریەتی سەرتاسەری بەسەر ئەدەب، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٤ لەخۆبوونەوە، بەڵام لە چین هەموو هەنگاوەکان لە ماوەیەکی پێوانەیی کورت و زۆر بەتووندوتیژ و دلڕەقانە هاوێشتران، کە بووە هۆی کوشتنی سەدەها نووسەرو زیندانکردنی هەزارانیش .

ڕابەرە کۆمەنیستەکانی چین بڕوایان بە چارەسەرکردنی مرۆڤ هەبوو لە ڕێگای لاشەییەوە، بۆیە دەبینین هەزاران ڕۆشنبیر و هونەرمەندو زاناو ئەدیبیان بێگارکرد لە کارە لاشەییە قورسەکان بە مەبەستی سەرلە نوێ بنیات نانەوەیان .

# قەسابخانەکانی فاشیستەکان

## یاری منداڵانە لە چاو قەسابخانەکانی کۆمەنیستەکان

قۆناغی یەکەمی فشارکردن لەسەر ئەدەب لە ساڵی ١٩٥٥ کۆتایی هات کاتێک ماوتسی تۆنگ جاڕی دروشمە بەناوبانگەکەیدا: (دەبا سەدەها خونچە بپشکوێ) کاردانەوەی ئەدیب و نووسەران زۆر خێرا بوو، هەر کەس لەلای خۆیەوە ئەو هەلەی قۆستەوە و دەستی کردە نووسین بە سەربەستی هەتا وای لێ هات ڕابەرانی حیزب دوچاری چورتم و چەپۆکێکی توند هاتن. چونکە هونەرمەندان هەموو جۆرە چەکێکیان بەکار هێنا بۆ هێرش کردنە سەر ڕژێمی ستەمکار .

هێرشەکان توندوتیژتر بوون لەگەڵ هەڵایسانی شۆڕشی هەنگاریا. ئەوەی خوارەوەش نموونەیەکە لەو بابەتانە کە لەو ماوەیە دەنووسران کە بریتیە لە نامەیەکی پرۆفیسۆر (یانگ کین شان) بۆ (ماوتسی تونگ) تێیدا دەڵێ:"دەستورمان سەربەستی نیشتەجێ و گواستنەوەی بە هاوڵاتیان ڕەوا دەبینێ، بەڵام لە ڕاستیدا لە نێو پێنج سەد ملیۆن جوتیار تەنها یەکێکیان مافی گواستنەوەی لە لادێوە بۆ شار پێ نەدرا.

لەلایەکی ترەوە دەستور دووپاتی دەکەنەوە کەوا سەربەستی هاوڵاتیان پارێزراوە بەڵام لە ماوەی هەڵمەتەکانی مل پێکەچ کردنی دوژمن و نەیارانی شۆڕش ئەو سەربەستییە بە دڕندەترین شێوە پێشێل کرا، کاتێک خەڵکانێکی لە ژمارە نەهاتوو زیندانی کران یان کوژران. جا ئەو ڕەفتارانە جگە لە جەورودستەم چی پێ دەڵێن.

ئنجا نۆرەی ڕشتنی جامی ڕق و قینە هات بەسەر ڕۆشنبیران ئەوانەی دوچاری ئازارو ئەشکەنجەیەکی وابێ بەزەییانەکرد هەتا جوتیارانیش ئامادە نین ئەو ڕەفتارانە بکەن لەگەڵ دەرەبەگەکان. ژمارەی ئەو ڕۆشنبیرانەی کە جۆری مردنی خۆیان هەڵبژارد بەخۆفرێدان لەسەر بانەکان یان خۆ هاوێشتنە ڕووبار یان بەژەهر نۆشتن یان بە بڕینی خوێنەڕۆیان گەلێک لەوە زۆرترن لە ژمارە بێن. ئەگەر قەسابخانەکانمان بەراورد بکەین لەگەڵ ئەو قەسابخانەی کە فاشیزمەکان لە شاری (نوشوستی) کردییان دەبینین هی ئەوان یاری منداڵانە لە چاو ئەوانەی ئێمە !!"

(هیباو)ی ڕۆژنامەنوس دەربارەی بڵاونامەکانی سەر دیوار (دیوارنامە) کە خوێندکارەکانی زانکۆ بڵاویان دەکردەوە، نووسی:"بەر لە ماوەیەک دەنگی هەورە تریشقەی بەهار بە چاکی نەدەبیسترا بەڵام ئێستا خونچە گوڵەکان گەشاونەتەوە، ئەوەش بووە هۆی بەدیار کەوتنی یەکەم ڕۆژنامەی ڕەخنەی زانکۆیی لەسەر دیوارەکانی زانکۆی پەکین لە ١٩ی ئایار. ئینجا دوا بە دوای ئەو چەندین

بڵاونامەی هاورێچکە بە دیار کەوتن هەمووشیان دووپاتیان لەسەر ڕازاندنەوەی باخچەی دیموکراتی و فراوانکردنی سەربەستی بیرورا دەکردەوە.. هەموو وایان دەزانی دەرگای ئازادی بیرورا کەوتۆتە سەر گازەرای پشت. بیرورا دەربڕین بە ئازادی بە شێوەیەکی وا بڵاوببووەوە لە ناو زانکۆکان دەتگوت خوێندکارانی زانکۆکانی ئینگلیزن و لە باخچەی (هاید پارک) کۆبونەتەوە گفتوگۆ دەکەن بە ئازادی ".

ئینجا پەتایەکە گوێزرایەوە بۆ پەیمانگاو فەرمانگەکانی تر تا گەیشتە ئەو رادەیەی ئەو جۆرە دروشمانەمان بە ئاشکرا گوێ لێ دەبوو: (لێژنەی حیزب لە حوکمڕانی وەدەرنێن).

(ڕۆژنامەکانی حیزب ڕاستی دەشارنەوە) جامی خەشم و قینەی خوێندکاران و مامۆستایان لە هەموو زانکۆیەک ڕژایە سەر حیزب. خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆی (نانکینگ) هەمان داواکانی خوێنکارانی زانکۆی پەکینینان دووبارە دەکردەوە.

ئەو ڕۆژنامانە کە بەر لەو کاتە لەرزۆک و خۆپارێز بوون ئێستا زۆر بوێرانە کەم و کورتییەکانیان دەخستە ڕوو چونکە خونچە گوڵە کراوەکان ببونە قەوزەی ژەهراوی .

حیزب زۆر تورەیی هەڵسابوو چونکە یەکەم جار بوو بەرەیەکی شۆڕشگێڕی لە ڕۆشنبیران و کرێکاران و جوتیارانی دەدیت والەیەک ڕیزی پتەودان لە دژی ئەو، هەرچەندە دەزگاکانی حیزب

زەبەلاح بوون بەڵام دروشمی (سەد خونچەگوڵ) گزیرانی پۆلیسی سیاسی شپرزە کردبوو، چونکە لە سۆنگەی ئەو دروشمەوە ئەرکی چاودێری کردنیان فەرامۆش کردبوو، لە ماوەی ئەو فەرامۆش کردنەدا مێژوو لاپەڕەیەکی نوێ و گەشاوەی تۆمار کرد لە ئەدەب و ڕۆژنامەگەری چیندا.

## حیزب سەر لە نوێ هەڵمەتەکانی پاکسازی دەست پێ دەکاتەوە

ئەو بارو دۆخەی کە لەو ماوەیە کورتەی واڵابوون هاتە گۆڕێ لە بەنداوێکی زۆر مەزنی هەرەس هاتوو دەچوو و تەوژمی لێشاوەکەی هەموو شتێکی لەبەردەمی خۆیدا ڕامالّی. بەو جۆرە لە ناکاو شەپۆلّەکانی سەربەستی قسەکردن و نوسینی بێ قەیدو شەرت و ڕەخنەی توندوتیژ دەورەی ڕابەرانی حیزبیدا. دەریشی خست هەوڵ و تەقەڵایەکانی شۆردنی دەماغ و ئاراستەکردنی بیروڕاکان بە تەواوی نوشوستی هێناوە. بۆیە حیزب کەوتە خۆ بۆ هەڵمەت کردنی پاکسازی سەر لە نوێ.

ئەو هۆیانەی کە پاڵی بە حیزبەوە نا بۆ توندو تۆڵ کردنی چاوەدێری سەرلەنوێ، ئەوە بوو، نووسەران لە هەر چوار لای جیهانی کۆمەنیست ئاگاداری ئەو ڕووداوانە بوون کە لە چین و بولگاریاو ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و پۆلۆنیاو هەتا ڕوسیا کە ڕوویان دەدا.

حیزب هەستی دەکرد، کە دروشمی (سەد خونچە گوڵ) و شلکردنەوەی کۆتی سەربەستی بیروڕا وەک داردەستێک بەکارهێنرا بۆ بەگژداچوونی دیکتاتۆریەتی حیزب. ئەوەی خوارەوەش چەند نمونەیەکە لەو جۆرە کاردانەوانەی لای نووسەرانی ئەو گەلانە.

ڕۆژنامەیەکی پۆلۆنی گوتی :"ئەوە خاڵی گۆڕانە لە چین واتە دەست هەڵگرتن لەو یاسا کۆنەی کە دەڵێت مارکسیزم کتێبێکی سەر مۆری پیرۆزە ئەوەش ڕزگاربوونە لەو سەردەمەی کە ڕاستییەکان بە یاسا دەخرانە بەر چاو نەوەک بە دۆزینەوە یان لە هەقیقەتدا".

هەر زوو بەزوو ڕادیۆی بۆدابست لە ڕۆژی ٢٥ی ئایاری ساڵی ١٩٥٧ ئەو کۆمێنتەی (تعلیق) خوێندەوە :"شێوازەکانی کۆمەنستی لە هەموو وڵاتێکدا ڕاست و دروست نین، لە هەموو قۆناغێکیش بەڕاست و دروستی بەڕێوە نابرێن، دەتوانین بە تایبەتی پاش سەرکوتکردنی شۆڕشی چەواشەی ئەم دواییە بڵێین هەر بەتەواوی ڕاست نین. هەروەها پێویستە بڵێین هاوڕێیانی چین زۆر لە ئێمە توندترو بێبەزەیانەتر قەڵاچۆی چینی بەرهەڵسکارانیان کرد لە پاش ساڵی ١٩٤٥، ئێستا دیموکراتییەتی گەل لە چین چەسپاو ڕەگی داکوتاوە، بەئاسانی جێی پێ لەق ناکرێ، لەبەر ئەو هۆیە دەسەڵاتداران دەتوانن ئازایانە و دلڕ فراوانانە ئەو دیموکراتییە بەر فراوان بکەن ".

هەر چۆنێکی بێت ڕابەرە کۆمەنیستەکان کە متمانەیان لاوازە بە ساغ و سەلامەتی ڕژێمەکەیان، سەرلەنوێ دەستیان دایەوە شێوازەکانی تۆقاندن، پاش ماوەیەکی کەم لە دەست لێ هەڵگرتنیان. لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٥٧ هەڵمەتی

(چارەسەرکردنی هەموو گەل) دەست پێکرا. هەڵمەتی سەرلەنوێ توانەوەی بیرمەندەکان بە هۆی کاری لاشەیی و ماسولکەیی دەستی پێکرد. جا بە پێی ئەو زانراوانەی کە ڕادیۆی پەکین بڵاوی کردەوە لە ٢٦ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٧ـدا، ٨١٠.٠٠٠ بیرمەند (مفکر،رجال الفکر) ئەو کاتە مەشقیان پێ دەکرا لە سەربازگاکانی کاری لاشەیی .

گزیرێکی پۆلیس گوتی:" ئەو پایەی کە ئێستا دراوەتە بیرمەندان و پێیان دەڵێن کرێکاری هۆشمەندی باڵا پێویستە تەفرو تونا بکرێت، هەروا پێویستە پێشیان ڕابگەیەنین کەوا گۆڕانێکی لاشەیی سەر تاسەر چاوەڕێیان دەکات".

# ئەدیبان دەکرێتە کرێکاری کار دەست

لە تەموزی ساڵی ١٩٥٧ ( گەل ئامادە بوو بۆ هەڵمەتێکی رق و نارەزایی دژی بیرمەندە نەیارەکانی حیزب. ئینجا پۆلیسی ئاسایی و تەنانەت فەرمانبەرانی حیزبیش هێرشێکی سەرتاسەریان دەست پێکرد، خەڵکێکی گەلێک زۆریان کۆکردەوە لە کرێکاران و جوتیاران و خوێندکارانی زانکۆکان لە کۆبونەوەی گەورە گەورەدا، ئینجا چەندەها نامەو بروسکەی کراوەیان ڕەوانەی سەرکردایەتی حیزب کرد، تێیدا داوایان کرد چینی نەیارو بەرهەڵستکاران بە توندی سزا بدرێن. یەکێک لەو نامانە خوێندکارانی زانکۆی پەکین ڕەوانەیان کردبوو ئەوانەی بەر لە ماوەیەکی کورت حیزب وەسفی کردبوون بەوەی کە هەموویان فریودراون بە پڕوپاگەندەی بە کرێگیراوان و کاسە لێسانی ئیمپریالیزم.

هەر لە تەمووز ڕۆژنامەی (جن من جیە باو) دانپێداهێنانەکانی بڵاوکردەوە، ئەوەش چەند نمونەیەکن لەو دان پێداهێنانەی کە لە ناونیشانی وتارەکان بوون :

**(سەرم شۆڕ دەکەم و دان بە تاوانەکانم دەنێم لە بەردەم گەل**
**لە (شانگ بۆ شین)ـەوە**
**(نـمایش کردنێکی هەڵەو تاوانەکانم)**
**لە(هیوانگ شاو)ــەوە**
**(بەچۆک هاتنێ: بۆ لێبووردنی گەل)**

**لە (هیونگ شی شیانگ)ــەوە**
**(بۆچی ئەو تاوانە گەورانەم کرد ؟)**
**لە (تان تی وۆ)ــەوە**
**(دان بەتاوانەکانم دەنێم لەبەر دەم گەلدا)**
**لە (مینی هیساو)ــەوە**

بەپێی ڕاپۆرتە ڕەسمییەکان خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆکان لە ژێر کارتێکردنی ئەو هەڵمەتە ببونە هاوکارو پاڵپشتی جەرگ سۆز بۆ ڕژێم، بۆیە بە خێرایی بە دەست و بردانە قۆڵیان لە کارکردن هەڵماڵی و دەستیان کردە زەوی کێڵان و بەنداو دروست کردن. هەروەها ڕۆژنامە ڕەسمیەکان هەواڵی مامۆستاو خوێندکارە ڕاکردوەکانی سەربازگەکانی کارکردنی بڵاودەکردەوە، بەو شێوەیە نیوەی ئەندامانی یەکێتی نووسەران (کە چوونە ناو ئەو یەکێتییە بە زۆری بوو) بە خۆشی خۆیان بوونە کرێکار. لەو بارەیەوە (پراڤد) ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە لە پەکینەوە لە ڕۆژی ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٧، ئەوەش دەقەکەیەتی:"لە ئاکامی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ڕۆژنامە ئەدەبییەکان و ڕێکخراوەکانی یەکێتی نووسەرانی چین، لەسەدا پەنجای ئەندامانیان دەخرێنە بەر کارکردن لە بواری کشتوکاڵدا. تەنانەت چەند نووسەرێکی چینی نیازیان وایە هەرلە بواری کشتوکاڵدا کاربکەن وبژین".

## گەورەترین ئافرەتی ئەدیب دەکرێتە کارەرکەر  لە چین

### هەندێک نوسەری بەناوبانگ لەو ماوەیەدا چیان بەسەر هات ؟

ڕۆژنامەی (بیبلز دایلی) پەکینی لە ژمارەی ٧ی ئابی ساڵی ١٩٥٧ـدا، هەواڵی ئاشکرا بوونی "ڕێکخراوێکی بەرهەڵستکارانی حیزبی ئاشکرا کرد، کە نووسەرێک هەڵگری خەڵاتی ستالین، خاتو (تینگ لینگ ) و (شن چشی) نووسەر ڕابەرایەتی یان دەکرد. ئەو ڕێکخراوە پیلانی دادەنا بۆ هەڵکوتانە سەر حیزب لە کۆڕی نیشتمانی ئەدەبیات و هونەر لە مانگی تشرینی یەکەم".

دوایی ڕۆژنامەکە بەو قسانە کۆتای بە ووتارەکەی هێنا :"حیزبی کۆمەنیستی سورە لەسەر ئەوەی کە ئەدەب و هونەر پێویستە لە ڕاژەی ئامانجە سیاسیەکان دابن پێداویستیەکانی قۆناغە جۆر بە جۆرەکانی شۆڕش دابین بکەن".

(تینگ لینگ) یەکێک بوو لە کۆمنیستە بەراییەکان و بەرزترین نووسەر بوو لە گشت چین دا، دانەری ڕۆمانی (ڕۆژ لەسەر ڕوباری شانگاکان هەڵدێ)یە، کە خەڵاتی ستالینی پێ وەرگرت لە ساڵی ١٩٥٣. تینگ لینگ سەرکردەو ڕابەری سەرسام کرد" کاتێک قایل نەبوو نکوڵی لە کردەوەکانی بکات، هەر چەندە لەوەتی ساڵی ١٩٣١ ئەندام بوو لە حیزب .

ئینجا لەنێو هەڵمەتە ناوزڕانە ڕەسمیەکانی چین کە دوا بەدوای ئەوە دەستی پێکرد، تەنها باسی نمونەیەک دەکەین:

ڕۆژنامەی (شینابوت) لە ١ی ئەیلولی ساڵی ١٩٥١ لە ژێر ناونیشانی (کارتێکردنی نەگریسی گیانی بۆگەنی (تینگ لینگ) ڕیشە کێش کەن) گوتی: نارەزایی و بێزاری سەرلەبەری وڵات دادەگرێت کاتێ نووسەرێک لە یادی دەچێ کە (ئەرکی ئەدەب ئەرکی بورغی و واشەرە لە ئامێرو دەزگای حیزب).

ئینجا (تینگ لینگ) لە هەموو ئەرک و وەزیفەکانی دەرکرا. یەکێک لە سزاکانی یان بڵێین شێوازێکی تەمبێکردنی ئەو کۆنە کۆمەنیستە کە ٢٥ ساڵ بوو لەو حیزبەدا بوو، جۆرێکی تایبەتی بوو لە کاری قورسی ڕیسواکەر. لە سەریان کرد حەوش و بان و پلیکانەی ساختومانی یەکێتی نووسەران لە پەکین پاک بکاتەوە.

## بایەخ دان بە چەندیەتی بەرهەمی ئەدەبی نەك بە چۆنیەتی

لە ساڵی ١٩٥٨ هەڵمەتی حیزب بە گوڕتر بوو دژی ئەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکردن، لە نووسەرە (کۆنەپەرستەکان) ئەوانەی وا دەزانن "ئەرک و ئامانجی سەرەکی ئەدەب و هونەر باس کردنی هەڵەو کەم و کورتییەکانی کۆمەڵگاکەمانە..." هەروەها حیزب تاوەنباری کردن کەوا"دوژمنی حیزب و گەلن. خائن و تێکدەرن".

لەوانەیە سەیرترین بەڵگەنامەی ئەدەبی لە جیهانی کۆمەنیستیدا ئەو نامە کراوەیە بێ کە یەکێتی نووسەرانی چینی لە ٧ی ئازاری ساڵی ١٩٥٨ بڵاویکردەوە. ئەوەش چەند برگەیەکی ئەو نامەیە:

"ئەگەر نووسەران دە هەنگاوی گەورە بۆ پێشەوە باوێن لە کاتی هەنگاوە گەورەکانی سۆسیالیزم بۆ پێشەوە. بێگومان شتی سەرسوڕهێنەر، یەک بە دوای یەک ڕوودەدات ؛ لە نێوەڕۆکی ئەو شتە سەر سەرهێنەرانەوە دەیەها شیعرو دراما و ڕۆمان دێنە کایەوە ... هەروەک چۆن ئێمە دەمانەوێ (بڕی) بەرهەم هێنانی پۆڵا بزانین لە وڵاتەکەمان، بە هەمان شێوە گەل دەیەوێت (بڕی) بەرهەم هێنانی ئێمە بزانێت لە بواری ئەدەبەدا. زانینی ئامانجەکان کرداری چاودێری ئاسان دەکات، ڕێگاش خۆش دەکات بۆ گەشەسەندن و ڕەخنەی خودی. پێویستە لەسەر هەر یەکێک لە

ئێمە خۆی بخاتە ژێر چاودێری بەکۆمەڵ و گشتی... ئەوانەی دەستیان هەڵگرتوە لە شیعر نووسین پێویستە هەر ئێستاو بەخێرای دەست بە نووسین بکەنەوە... پێویستە لەسەرمان شتێک داهێنین، کورت بێ یان درێژ. ئەگەر ئەو (ژمارانە)مان بەرهەم هێنا کە یەکێتی نووسەران چاوەڕوانیمان لێدەکات، ئەو کاتە بواری پاشەکشەکردن بۆ دواوە نامێنێت. چونکە هەر پاشەکشەیەکمان کرد ئەوا متمانەی گەل لە دەست دەدەین".

لە پاش شەش مانگ سەرۆکی یەکێتی نووسەران باسی ئەو هەنگاوە گەورەیەی کرد کە لە بواری ئەدەب هاتە کایەوە :"لە مانگی حوزیران و تەموز و ئابی ئەم ساڵ ئەو شانۆگەریانەی کە پێشکەش کران، دوو هێندەی ئەو شانۆگەریانە بوون کە پار پێشکەش کران. هەروەها ژمارەی شیعرو ڕۆمانیش دوو قات زیادیان کردبوو.

جا لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران لە زیندان بوون، یان بۆ سەربازگەکانی کارکردن ڕەوانەکرابوون، داوایان لە ملیۆنەها کرێکار کرد بە خێرای دەست بدەنە نووسین، تاکو بیسەلمێنن کە پێویستیان بەو نووسەرانە نییە (کە هونەرمەندن زیاتر لەوەی کۆمەنیستی سور بن) لەمەودوا گرنگ نییە نووسەران لە نووسین مان بگرن، چونکە کرێکاران و جوتیاران دەتوانن لە جیاتی ئەوان بنوسن!!

ئاژانسی دەنگ و باسی چین لە ٢٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٨ ئەو هەواڵەی بڵاوکردەوە:"لەبواری ئەدەب و هونەر دەتوانین سەرنجی گەشەسەنێکی باڵاو بێ وێنە بدەین لە نێو چینی کارگەران ... لە سولد-هسین، لە ئوستانی هوبێ نیوەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کە ژمارەیان (٤٠٠.٠٠٠) کەسە لە بوارە جۆربەجۆرەکانی هونەرو ئەدەب کار دەکەن. تا ئێستا ١٤ ملیۆن مادەیان بەرهەم هێناوە لە شیعرو ئەدەب و وێنە... هتد لە ئوستانی کیانگسو (٣٠٠.٠٠٠) کرێکارو جوتیار لە شەش مانگی ڕابردوودا نزیکەی ١٠ ملیۆن مادەی هونەری و ئەدەبییان بەرهەم هێناوە، هەروەها کرێکارانی شانگاهای (٨٠٠.٠٠٠) بابەتی هونەری یان بەرهەم هێناوە لە سێ مانگ".

لەو ڕۆژگارە ٦٥٠ ملێۆن چینی بە ئارەزوی خۆیان کاریان دەکرد بە (حەماسەتێکی زۆرەوە). ئەوەی هەبوو خەریکی باڵندە کوشتن بوو هەشیان بوو بابەتی هونەری بەرهەم دەهێنا. کە لەو ساتەوەختانەدا هەندێک ڕۆژنامەنووس دوچاری گیروگرفتێکی زۆر هاتن لە ئەنجامی ئاماژە کردنیان بۆ مافی  سروشتی گەل لە ٨ کاتژمێر نووستن  بەڕێوەبەرانی. بەرهەم هێنانیش بەر پرسانی ڕۆشنبیرییان ڕەخنە باران دەکرد، لەبەر ئەوەی هانی کرێکارانیان دا بۆ خۆدزینەوە لە کاری بێگاری زۆرەملێ و بەفیرۆدانی چوار کاتژمێر بەبیانوی نووسینی چوار دێرە شیعری دژمان و بێ ناوەڕۆک. هەر

ئەو جۆرە شیعرانەش بوون کە یەکێتی نوسەران بە شانازیەوە دێر دێر دەیانژمارد.

ڕۆژنامەی (بیبلز دایلی) پەکینی لە ٢١ی نیسانی ساڵی ١٩٥٨ چەند نموونەیەکی لەو شیعرانە بڵاوکردەوە، کە (ئەدیبە تازەکان) بەرهەمیان هێنابوو، ئەوەش نموونەیەکە:

**خۆشەویستم لە بناری چیا**

**لە هونگمیشوانگ نیشتەجێیە**

**منیش نیشتەجێی باکوری چیام**

**لە سینگهواتکون**

**ویستم گۆرانیەکی بۆ بچڕم**

**بەڵام چیاکە دەنگی بڕیم**

**ویستم گوڵێکی دیاری کەم**

**بەڵام چیا نشینەکان تەگەرەیان خستە ڕێم**

**ئەو ساڵ هەردوو بەری چیا**

**لە یەک خێزان کۆبوونەوە بۆ هاریکاری**

ئێستا دەتوانم هەموو ڕۆژێک ببینم

ئەوەش لە نموونە بەرزو باشەکان بوو، وا بزانم پێویست بە تەعلیق لێدان ناکات .

## ئەدیبان لە کارگەی پۆڵا کار دەکەن

ئەم کەین و بەینەش سەری نەگرت و ئەنجامی چاوەڕوانکراوی بەدەستەوە نەدا. ژمارەیەکی زۆریش لە نووسەران هەر بە بێ دەنگ لەسەر مانگرتنەکەیان بەردەوام بوون، هەندێکی تریش شتی وایان نووسی کە (بە کەڵکی بڵاوکردنەوە نەدەهاتن) هەندێکە تریش توانیان (بابەتی زیان بەخش دەربارەی کۆمەڵگەی چین) بڵاوبکەنەوە، کەلە ئاکامدا سزا دران. دیکتاتۆری ئەدەب هاورێ (کومۆجۆ) سەر لە نوێ بەگژ (بیرمەندە کۆنەپەرستەکان) دا هاتەوەو گوتی :"هاوڵاتیان ڕازی نین لەو بیرمەندانەی کە نەیانتوانی هەنگاو بنێن بۆ پێشەوە"، وهەروەها گوتی:مێژوو چاوەڕوانی کەسێکی دیاری کراو ناکات. مێژوو دژی سۆزو عاتیفەیە، کۆمۆنیستیش شۆڕشێکی بەردەوامی بێ بڕانەوەیە بۆیە دەبێت توانەوەی بیرمەندان لە بۆتەی شۆڕش ببێتە شۆڕشێکی بەردەوامی هەمیشەیی".

ئەو بیرمەندە شۆڕشگێڕانەی کە نەیانزانی وشەی (پۆلیسی نهێنی) لە جیاتی ووشەی (مێژوو) دابنێن، هەر دەمودەست بە خێرایەکی سەرسوڕهێنەر زانیان کە پۆلیسی نهێنی چاوەڕوانی ئەو کەسانە دەکات، کە (مێژوو) ڕازی نییە چاوەڕوانیان بکات. لە ٦ی ئازاری ساڵی ١٩٥٦ ئاژانسی دەنگ و باسی نوێ چین ڕایگەیاند کەوا پێویستە لەسەر هەموو کەسێک (ئەوەی حیزب خۆشی دەوێ و پێی خۆشە، ئەویش خۆشی بووو و پێی خۆش بێت و ئەوەی حیزبیش ڕقی لێیەتی، ئەویش ڕقی لێ بێتەوە".

ئەو نووسەرانەی کە توانیان خۆیان بدزنەوە لە سەربازگەکانی کارکردن یان زیندان کردن موچەیان لێ برین. ئینجا ڕۆژنامەی (بیبلز دایلی) لە ٥ی تشرینیەکەمی ساڵی ١٩٥٨ هەواڵێکی بڵاوکردەوەو گوتی چاپکەرانی پەکین پەیرەوی چاپکەرانی شانگەهایان کرد، لە هێنانە خوارەوەی ڕێژەی ئەو پارەیەی کە دەیاندا نووسەران بۆ (٥٠%) پەنجا لەسەدا.

ڕۆژنامەکە بڕوبیانوی بۆ ئەم کارە هێنایەوەو گوتی:"ئارەزوکردنی پاداشتی پارە و پول بوو، کە پاڵی بە نووسەرانەوە نا بیرۆکەی خۆپەرستی بورژوا گەشە پێ بدەن لە پێناو شۆرەت و ناوداری و دەستکەوتە مادییەکان هەر ئەوەش بوو ئەو بیرۆکە چەوتەی گەورە کرد، دەربارەی بێزلێکردنەوە لە کاری دەستی ... بەڵام ئیمرۆ

ئەدیبان لە پێناوی سۆشیالیزم کاردەکەن، نەک لە پێناو شۆرەت و پارە و پول."!

پاش چەند ڕۆژێک یەکێتی نووسەران بە گەرمی ئافەرینی لێکرا لە سەرکەوتنی لە کۆکردنەوەی خوێنەران و ڕۆمان نووسان و چیرۆک نووسان و ڕەوانەکردنیان بۆ کارگەکانی پۆڵا بۆ کارکردن .

هەر تشرینی یەکەمەوە ڕۆژنامە ڕەسمییەکان ئاماژەیان بۆ ماندوویی و شەکەتی گەلی چین دەکرد، لە دەست سیاسەتی هەنگاوێکی مەزن بەرەو پێشەوە .

ئەو کۆکردنەوە بەزۆرملێیانە بووە هۆی پڕ بوونی سەدەها گوند و ناوچەی فراوان بەخەڵک، سەرەڕای ئەوەی کە خۆشیان پڕبوون لە دانیشتوان. بەکورتی ئەو ناوچانە ببونە عەمبارێکی بەشەری پڕاوپڕ، ئەوەش بووە هۆی جیا کردنەوەی ئافرەتان و منداڵان لە پیاوان و دانانی هەر دەستەیەک لە سەربازگەی تایبەتی خۆی. ڕۆژنامەکانیش لە سوچێکی شاراوەدا ئاماژەیان دەکرد بۆ ڕوودانی دەبەرێک چوون و شۆڕشی ئاشکرا لێرە ولەوێ، تەنانەت خرۆشۆفیش لە بەردەم کۆنفرانسی بیست و یەکەمدا، حیزبی کۆمەنیستی چینی تاوەنبار کرد، بە ڕوخاندنی ژێرخانی کۆمەنیستی بەو هەوڵ و تەقەلایەی کە دای بۆ بازدان و گەیشتن بە کۆمۆنیزم بەر لەوەی بارودۆخی ئابووری گونجاوی بۆ برەخسێ .

ئەوەی گرنگە لەو دان پێهێنانەی خرۆشۆف ئەوەیە کە ئێش و ئازاری ملیۆنەها چینی کە ناردران بۆ کاری بێگاری و زۆرەملێ هەمووی بە فیرۆ چوو.

## هەڵمەتێکی نوێی ڕق وقین

بڕیاری لێژنەی ناوەندی دەرچوو بە کەمکردنەوەی هەڵمەتی کۆکردنەوە، ماوەیەکی واڵابوون هەر بە دوای ئەو بریارەدا هات، نووسەران گەڕانەوە سەر نووسینی ڕاشکاو بێ پێچ و پەنا، بەڵام هێندەی نەبرد شۆڕشی تیبت هەڵگیرساو دام و دەزگای حیزبیش بە گوڕ کەوتەوە بەدرەفتای نواندن لەگەڵ نووسەرو ڕۆشنبیرو هونەرمەندان، هەڵمەتێکی نوێی ڕق و قین دەستی پێکردەوە، کە قوربانییەکانی ژمارەیەکی زۆر بوون لە کەڵە ئەفسەرانی سوپا و خاوەن کارگەکان و خوێندکاران و مامۆستایان.

بە گوێرەی کۆریای باکور دەتوانین بڵێن هەمان بارودۆخی چینە. چونکە حیزبی کۆمەنیستی لە کۆریا لەژێر سایەو ڕێنموویی فەرمانەکانی حیزبی کۆمەنیستی چین دەچێت بەرێوە. سەرنجمان داوە کە بڕیارەکانی حیزب لە کۆریای باکور هەردەم داوایەکی لە گەلە و بە شێلگێرییەوە داوا دەکات لە نووسەرانی کۆریا لە پشت لێژنەی ناوەندی بوەستن و بەرگری بکەن لە بڕیارەکانی: ڕۆژنامەی

(تەنگ سنمون) دەمڕاستی حیزب داخوازییەکانی حیزبی لە نووسەران لەو چەند خاڵە کورت کردەوە:

١- فێرکردن و گۆشکردنی گەل بە ئایدۆلۆژیەتی کۆمەنیستی .

٢- نواندنی گەشبینی دەرهەق سەرکەوتنە چاوەڕوانکراوەکانی دوا ڕۆژ، ئەوەش تەنیا بەو نووسەرانە دەکرێ کە تەیارو ئامادەباش بن بە تێڕوانینی مارکسیزم و لینینزم لەمەڕ جیهان .

٣- دەبێت حیزب نووسەران ناچار بکات بە ڕێگای حیزب و شێوازی حیزب بیرکەنەوەو بەرهەم بێنن وکار بکەن و بژین.

ڕۆژنامەکە زیاتر لەسەری ڕۆیی و گوتی: نووسەرو هونەرمەندان هەرگیز لە ژیانیاندا سەر ناکەون، ئەگەر خۆیان چەکدار نەکەن بە سیاسەتی حیزب و پشت نەبەستن بە ڕێنمویەکانی حیزب. پێویستە نووسەرو هونەرمەندان وەک مێوان و ڕێبوارو سەیرکەری بەر سێبەر نەبن. پێوستە بەشداری بکەن لە ترش و تاڵی کرێکاران لە وێندەرێ لە گۆڕەپانی کارکردن، کەوا بوو دەبا دەوری لێژنەی ناوەندی حیزب بدەین بە ڕابەرایەتی (کیم ئیل سونگ) بەرەو پێشەوە هەنگاونێین و ئاڵای ڕیالیزمی سۆشیالیزمی بەرز بکەینەوە. بەڵام هەتا مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ نەمان بیست ئەو ئەدیب و هونەرمەندانەی کە بەشداری تاڵی و سوێری جوتیارانیان و کرێکارانیان کردبوو یەکێکیان لەو گەشتە بگەڕێنەوە !

# سەربازگەکانی گرتن لە ڤێتنامی باکور

## فوباو: باسترناکی ڤێتنامە

گزیرانی پۆلیس لە ڤێتنامی باکور، ئەوانەی لە هەندێک لایەن سەرکەوتوتربوون لە مامۆستا چینییەکانیان، دوچاری تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر هاتبوون بە دەست ئەدیبان و نووسەرانیان، ئەو ئەدیب و نووسەرانەی کە لەگەڵ ئەو هەموو هەڵمەتە قەلاچۆکردنە وەرزییانەی دەرهەقیان ئەنجام دەدرا، بە گرتن و لەسێدارەدانیان، بەڵام هەر بەردەوام بوون لەسەر خەباتی سەختی بێ وچانی خۆیان، تەنانەت بەردەوامیش بوون لە نووسینی (بابەتی کۆنەپەرست و زیان بەخش و ژەهراوی) لە توندوتیژترین ماوەکانی دژە هێرشی حیزب بۆ سەر ئەواندا.

ڕێژەی کوشتن و خۆکوشتن بە شێوەیەکی ئاسایی وەکو هەموو وڵاتە کۆمەنیستەکان بەرز بۆوە، نەک بە تەنیا لە نێو نووسەراندا بەڵکو لە نێو ڕۆژنامە نووسانی گۆڤارو ڕۆژنامەکانیشدا.

هەموو بڵاوکراوەو چاپەمەنییەکان لە سەرەتادا لە ژێر چاودێری حیزب دەستیان بەکار کرد، گرنگترینیان (جیای فام) و(نهان فان) بوون، کە دوای هەڵوەشێندرانەوەو لە جیاتی ئەوان ڕۆژنامەی (فان)یان دەرکرد لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٧دا، بۆ سەپاندنی دەسەلاتی حیزب بەسەر ئەدەب. لە پاش دەرچونی یەک

دوو ژمارەی تا ڕادەیەک باش.. یەکسەر مۆری کۆنەپەرستی یان بە نێوچەوانی ڕۆژنامەی (فان)یش وەنا، ئینجا لە ساڵی ١٩٥٨ هەر بەیەکجاری ناوی ون بوو. دوایی لە جیاتی ئەو ڕۆژنامەی (فان هوک) یان دەرهێنا، کە ئەویش چی نەبرد کەوتە بەر تەشەرەو توانجی ڕەخنەکانی حیزب، ئەو حیزبەی کە بە هیچ ڕۆژنامەیەک ڕازی نەدەبوو.

لە ڤێتنامی باکوور پاکسازیەکی گەورەو فراوان ئەنجام درا لە دژی چینی بەرهەڵستکاران بە یارمەتی دوو هاوپەیمانە گەورەکان یەکێتی سۆڤیەت و چینی میللی.

ئینجا کاڵای نازناوی (وەرزێرە دەوڵەمەندە چەوسێنەرەکانیان) بڕییە باڵای چەند وەرزێرەکی هەژارو نەدارو چەند جوتیارێکی بچوک، ئینجا بە سەدانیان لێ کوشتن و هەڵواسین. ئینجا با بێینە سەر باسی (فوباو) کە بە باسترناکی ڤێتنامیان ناو دەبرد، هەرچەندە جیهانی ڕۆژئاوا نووسەری مەزنی سۆڤیەت (باسترناک) دەناسێت، بەڵام بە داخەوە فوبای مەزن و ناسراو و ناودار نییە لەو جیهانە.

فوباو لە یەکێک لە ڕۆمانەکانی (نزیک بوونەوەی ئاهەنگی زەماوەند) کە لە ئەیلولی ساڵی ١٩٥٧ بە چاپی گەیاند، باسی ڕووداوی دڵدارو دلبەرێک دەکات، کە تازە پێک گەیشتبوون، دوایی

هەردوکیان دەگیرێن لە هەڵمەتی پاکسازی (کشتوکاڵیدا) ڕۆژنامەی (فان هۆک) لە ژمارەی مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٨ هێرشێکی توندی بردە سەر ئەو ڕۆمانەو نازناوی (ئابڕوبەری) لێ نا، چونکە خێزانی کچەکە بە هەڵە پۆلێن کرابوو لە ڕیزی موڵکدارەکان، کە ئەوەش دوچاری سەر ئێشەیەکی زۆری کردن، دوایی ڕۆژنامەکە لەسەری ڕۆیی و دانی پێداهێنا کە:"ئەوانەی بەهەڵە لە ریزی موڵکداران حسێب کران لە هەڵمەتی پاکسازی کشتوکاڵیدا بێ گومان خەڵکێکی زۆر بوون" بەڵام دەستی هەڵبڕی لە دژی هەڵوێستی سەلبی نووسەرو گوتی :"بەکورتی، لە گۆشەنیگای (فوباو) دا ڕژێمەکەمان بۆگەن و گەندەڵە. لە کاتێک دا دەبینین باسی دیمەنی ئەشکەنجەدانی ستەمدیدەکان و فەرمانەکانی لە سێدارەدان دەکات بە گازاندەو نارەزاییەوە. لەلایەکی تر هەر بە دەگمەن نەبێ باسی سەرکەوتنەکان ودەسکەوتەکانمان ناکات، دەبینین فرمێسک دەبارێنێ بەسەر مەزارگەی سکرتێرێکی حیزب کە بەبێ تاوان لە سێدارە دراوە. بەڵام ورتەی لەدەم نایەتە دەر بەرامبەر گۆڕی موڵکدارێکی ستەمکارو چلێس کە لە تەنیشت مەزارگەی ستەم لێکراوەکەیە سەرەڕای ئەوەش ڕۆمانەکە ڕێبازی مەیدان خوازی سیاسی دژی هەڵەکانی پاکسازی گرتۆتەبەر. هەروەک هەموومان پێی ئاگادارین، کەوا ڕیشەکێش کردنی هەڵەکان و هۆیە سەرەکییەکانی ئامانجی سەرەکی سیاسەتەکانی حیزبەکەمانە، سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕابردوو و ئەو زیانانەی کە پڕ ناکرێنەوەو

ماوەیان بەسەر چووە، کەس مافی ئەوەی نییە چاوەڕێی موعجیزە لە حیزب بکات و ئەو زیانیانە تێهەڵێنێتەوە".

لەگەڵ ئەو ڕەخنانەش (فوباو) پاشگەز نەبۆوەو وەڵامی دایەوە و گوتی :"هەتا ئێستا خێزان گەلێکی زۆر و زەوەند هەن دەناڵێن لە ژێر باری ستەم و ناوزڕاندندا سەبارەت بە بۆرە پیاوانێکی وەکو ئێمە کە نەوێراین بەرگری لە هەق بکەین لە ماوەی گەردەلولە نوێیەکەدا".

"بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ڕاپۆرتانەی کە سازکراون لە پاش گرتنی ژمارەیەکی زۆر لە نوسەران، ئاماژە دەکەن بۆ نووسەرانێکی زۆر کە بەرگریان کردوە لە مافەکانی گەل، بەبەڵگەی ئەوەی کە زۆربەیان بونەتە میوانی زیندان وگرتوخانەکان".

## بستە باڵای دڵ فراوان لە زەبەلاحی بێ دڵ چاکترە

لە زنجیرەیەک وێنەی تەنزو کاریکاتێریدا، نیگارکێش و ڕۆمان نووس (تران دۆی) هێرشێکی توندی کردە سەر(ڕیالیزمی سۆشیالیزم) لە یەکەم وێنەی ئەم زنجیرەیە وێنەی هونەرمەندێک دیارە کە سەرگەرمی نیگار کێشانی گوڵێکە بە ئەسپایی، لە وێنەی دووەمدا گزیرێکی نابەڵەد لە هونەر دیارەو پرسیاری ناقوڵا ئاراستەی نیگار کێشەکە دەکات، دووپاتی دەکاتەوە کە پێویستە نیگار کێشان لە ڕاژە و خزمەتی پەیامی سیاسیدا بن.

لەسەرەتا فەرمانی پێدەکات وێنەی کرێکارێک بکێشێت، (جا لەبەر ئەوەی کرێکاران و جوتیاران و سەربازان یەک پارچەن و جیا ناکرێنەوە) دەبێت وێنەی جوتیارێک و سەربازێکی تر بخاتە سەر تابلۆکەی. ئینجا گزیرەکە دەڵێت:" پێویستە هەر یەکێک لە کرێکارو جوتیارو سەرباز بە (دەستە و تاقم) پاڵپشت کرابێت بۆیە پێویستە وێنەی ئاپۆرەی جەماوەرێک بکێشێت لە پشتی هەر یەکێکیانەوە. لە کۆتاییدا دەبینین نیگار کێشەکە پەتی ئارامی پچڕاوە و فلچەو بۆیەو تابلۆکەی توور داوەتە ئەو ناوە، بە نائومێدی چاوی بڕیوەتە بەیداخ و جەماوەری هەڵمەت بردوو، تابلۆی گوڵەکەش لە ژێر پێیان هەڵپڕوکاوە.

هەروەها (تران دۆی) نووسەری چیرۆکی (زەبەلاحەکان)یشە، ئەو زەبەلاحانە چیاکان دەبڕن و زەریاکان بێگار دەکەن، بە بێ

ئەوەی گوێ بدەنە ناڵەی ئەوانەی لە سۆنگەی ئەو کارە قورسانەوە ئەنجن بە ئەنجن دەبن .

نووسەر ویستویەتی بڵێت:" زەبەلاحەکان بە بێ دڵ دروست کراون. پاڵەوانی ڕۆمانەکە گوزارش لە هەستی خۆی دەکات و دەڵێت:"ئەگەر بتوانرێ زەبەلاحی خاوەن هۆش و بە دڵ دروست بکرێت، بێ گومان ئەوە شتی چاکە. بەڵام ئەگەر لە تواناادا نەبوو، چاکترە کارەکەری بچوک بە قەد باڵای مرۆڤی ئاسایی دروست بکرێت بە مەرجێک خاوەن دڵ و دەرونی فراوان بن) ... لە کۆتاییدا (تران دۆی) گیراو لە نووسینیش قەدەغەکرا. بەڵام لای هەندێک نووسەری تر زەبەلاحەکان بە تەنیا بێ دڵ نین بەڵکو بێ مێشکیشن، نووسەری ڕۆمانی (گەلەکۆم بوونی ئامێرە میکانیکیەکان)ی (مین هوانگ) نەفامی و دەبەنگی و ساویلکەیی گزیرە پۆلیسەکانی بواری ئابووری و پیشەسازی دەردەخات. بۆیە ڕۆژنامەی (نهان دان)ی ڕەسمی (مین هوانگ)ی تاوەنبارکرد بە خۆپەرستی و لووت بەرزی و تێکدەری. (مین هوانگ) لەو چیرۆکەدا توانج دەگرێتە گەندەڵی پرۆگرامی بنیات نەرانەی حیزب کە چۆن بە هەزاران گیان و ئامێری فەوتاندوە. هەروەها (مین هوانگ) زۆر بەبێ شەرمانە زاتی ئەوەی کرد هێرش بباتە سەر یارمەتییە جوامێریەکانی وڵاتە هاو ڕێبازەکان).

پاش ئەوەی کە (مین هوانگ) بە ئەندامێتی کۆمەڵەی (تران دان) تاوەنبارکرا. (تران دان) شاعیرێکی لاو بوو زۆر بە بێ رەحمانە هەڵسوکەوتی دەرهەق کرا لە سەربازگەیەکی زیندان، دوایی بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەبەر چاوان بزر بوو. لەوانەیە ئەو نووسەرەش کە ناچارکرا بێدەنگەی لێ بکات دوچاری هەمان چارەنووسی تەم و مژاوی هاوەڵەکانی بوبێت. لە ماوەی نێوان مانگی شوبات و ئازاری ساڵی ١٩٥٨دا (هەزارەها نووسەر و هونەرمەند و کەلە رۆشنبیران ئامادەی زنجیرە وانەیەک بوون کە حیزب رێکی خستبوو).

کە ناونرا بوون بە (وانەکانی خەبات). ئەو ناونیشانی ناوێکی روکەش بوو بۆ هەڵمەتی پاکسازی بیرو هۆشی بە کۆمەڵ. بەشداربووانی ئەو کۆڕانەش (میوانانی) قوتابخانەکانی حیزب بوون.

رۆژنامەی ((کیو کوک)) لە ٢٧ی نیسانی ساڵی ١٩٥٨ نوسیویەتی :"ئەو نووسەرو هونەرمەندانەی کە ئامادەی ئەو کوڕانە بوون، ((لە سەرەتادا دانیان بە تاوەنەکانیان دانەهێنا. ئەوەش شتێکی نوی نییە)). بەڵام دوایی ئیعترافیان کرد لەسەر خۆیان و رابەرانی چەتە و لادەرەکانی تر. ئینجا بەشدار بووان نامەیەکیان ئاراستەی (سنتکوم) کرد، تێیدا پەیمانیان دا بوو کە بەپێی توانای خۆیان بەشداری بکەن لە (خەبات) بۆ چارەسەرکردنی دەروونی خۆیان و سەرلە نوێ بنیاتنانەوەی لە بۆتەکەی حیزبدا. لەدوای دا

ئیعتیرافەکان و ڕەخنەخودییەکان بە کۆمەڵ لە ڕۆژنامەکان چاپکران، بە دوای ئەوەش چەندەها وتار لە ڕۆژنامەکان بڵاوکرانەوە، کە هێرشیان دەبردە سەریان و تاوانباریان دەکران بە دوو ڕوویی ، داوای دان پێداهێنانێکی زۆرتریان لێدەکردن. ئەو ئیعتیراف پێکردنەو هێرش بۆ کردنە بە دوای ئەو ، شێوازێکی کۆنی بە ناوبانگە لە یەکێتی سۆڤیەت و چین و وڵاتانی تر (لە ماوەکانی پاکسازیدا) چونکە کۆمەڵگەیەکی گەورە پێکدینێ لەپرۆسێسی هەڵمەتی پاکسازی هۆش و شۆردنی دەماغ دا.

هەندێک لە نووسەران پاش ئەوەی ئامادەنەبوون خۆیان تاوەنبار بکەن و ئیعتیراف بکەن ون بوون. هەندێکی تریش تاوەنبارکران بە تێکدەر و ترۆتسکایەتی وەک (نگوین هوانگ و تران تیوباو)و گەلێکی تر ، هەروەها تاوەنبارکران بە دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ کۆنەپەرستان و سیخوڕانی ئیمپریالیزم. لە پاش چەند ڕۆژێک ، بە ڕەسمی جاڕی گیرانیان بۆ درا. تا ئێستاش نازانرێ ئایا لە سێدارە دراون یان نا.

# چۆن بەرگری نووسەرە ئازادیخوازەکان هەرەسی هێنا

لەماوەی مانگی نیسان و ئایاری ساڵی ١٩٥٨ هەڵمەت بەردەوام بوو لە دژی هەندێک نووسەر (لەوانە سێ شاعیری ناودار و دوو سەرنووسەر و چەند چاپکەر و مامۆستای زانکۆ)ی تێدا بوون، ڕۆژ نەبوو ڕۆژنامانەی بە گەرمی هێرشیان نەکەنە سەر، ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو کە ئەو ڕژنامانە شێوازە نەگریسەکانی پۆلیسی نهێنییان بەکار دەهێنا دەستیان دەکردە بڵاوکردنەوەی چەندین تاوانە ساختەکۆنەکان و چەند نموونەیەک لە نامەکانی خوێنەران کە تێیدا داوای سەپاندنی توندترین سزا و ئەشکەنجە دەکەن بەسەر تاوەنبارەکان، سەرەڕای لێشاوێک لە سوک و ڕیسواکردنی کەسایەتی. لەپاشان لە هەموو لایەک تاوەنبار دەکران بە کاولکاری یا ترۆتسکایەتی یان هەر شتێکی تر.. ئەو شێوازە توندو تیژە بەمەبەستی چاوترساندنی ئەوانیتر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام بوون لەسەر هەڵوێستی نەگۆڕیان. لە تەمووزی ١٩٥٨ یەکێتی نووسەران چەند ئەندامێکی ناوداری دەرکردن، چونکە (بەردەوام بوون لەسەر هەڵوێستی هەڵەیان) هەروەها ئەندامێتی چەندانیتری هەڵواسرا، ئاگادارییەکی توندو تیژیشی ئاراستەی (هەندێک نووسەر کرا، لەبەر ئەو کردەوە هەڵە و چەوتانە کە پێی هەڵسابوون).

هەڵبەتە نووسەرە دەرکراوەکان ماوەی بڵاوکردنەوەی هیچ شتێکیان پێ نەدرا، هەروەها چاپکەرانیش خۆیان لەو نووسەرانە لادەدا کە ئەندامێتی یان هەڵواسرابوو ، بەو شێوەیە بەرگری ئەدیبان و نووسەران هەرەسیهێنا .

دەبوایە حیزب کاری خۆی تەواو بکات. بەدەرکردنی ئاگاداری کردنەوەیەکی ڕەسمی دەرچوو ((کەوا پێوستە لە سەر هەموو کرێکارانی بیر لە هەر ئاست و پلەیەکدا بن خۆیان دامادەکەن و نۆرە بگرن بۆ ئەنجامدانی کارە لاشەییەکان لە کارگەکانی وڵات و لە تیپە سەربازییەکان).

لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٩ ررۆژنامەی ((گەلی ڤێتنامی)) گوتی هەموو نووسەران یان زۆربەیان بەسەر کارگەو کانەکان پەرت و بڵاوکرنەتەوە بۆ فێربوونی کارێکی بەرهەم هێنەر. پۆلیسی ئاسایش بۆ خۆی چاوەدێری و سەرپەرشتی هەڵمەتی خۆ گۆڕینی دەکرد بە هۆی کارە لاشەیەکان.

هێندەی نەبرد بە خێراییەکی ئەندێشەیی وێنەی نووسەر و هونەرمەندان ڕۆژنامەکانی داگیر کرد، بەبزەیەکی ساختەوە سەرگەرمی چاڵ هەڵکەندن و زەوی کێڵان و کارەکانی تر بوون .

بەڵام هەندێک لەو نامانەی کە هونەمەندان خۆیان نووسیبویان ئابڕوی بزە ساختەکانیان دەبرد، لە وانەش:

(لەکاتژمێر پێنجی بەیانی دا کار دەستی پێدەکرد)

(ژەمەکانم گۆشت ناناسێ بە تەنیا ئاشنای گژوگیایە )

لە پاش سێ مانگ کۆبوونەوەیەکی یاد خستنەوە بەسترا بۆ بێگاران، نووسەرو ئەدیبان و بیرمەندان هێشتا ئامادە نەبوون دان بە تاوانەکانیان دابنێن ، بۆیە سەر لە نوێ خرانە بەر بێگاری بۆ ماوەیەکی نادیار، بە بیانوی ئەوەی (هێشتا تۆوی سۆشیالیزم لە دڵەکانیان چەکەرەی نەکردبوو).

## هاوار لەو تاوانەم: خەونم بەسەربەستیەوە دەدیت!

هەڵبەتە هەموو چین و توێژێک لەناو رۆشنبیران هاودەردی هونەرمەندان و نووسەرانیان بوون .

ئەوەتا لە ١٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ ڕادیۆی هانۆی ڕایگەیاند، کە هەر چەند وڵات گەلێک پێویستی بە پزیشک و نۆژداران هەیە (لەگەڵ ئەوەشدا تیپی دووەم کە پێک هاتبوو لە ١٣٠٠ مامۆستا و خوێندکار لە پەیمانگای پزیشکی و دەرمانسازی هانۆی، بەرەو ناوچەی (های دۆنگ) بە ڕێکەوتن بۆ کاری رایی)

هەر لە مانگی ئەیلولیش ٣٠٠ ئەکتەری "کوڕ و کچ"ی شانۆ نیشتمانییەکان (بە خۆشی خۆیان) بۆ کارکردن هاتنە پێشەوە .

ئینجا مامۆستای فەلسەفە (تان دوک تاو) دانی پێدا هێنا کە ڕۆژنامەی فەرەنسی بە کۆمەڵەی نووسەرانی ((نهان فان)) داوە کە (ڕاستی مەسەلەی هەنگاریای شێواندبوو و هێرشیشی بۆ سەر یەکێتی سۆڤیەت کردبوو..) هەروەها دانی بەوە هێنا کە گوتویەتی:"سەرکەوتن بۆ دیموکراتیەتی دژی ستالینزمە" ئینجا درێژەی بە قسەکانیداو گوتی: (مەبەستم لە دووپاتکردنەوە لەسەر سۆشیالیستی یۆگسلاڤی و پۆلونی ئەوە بوو ستایشی لایەنە چارەسەرکراوەکانی بکەم کە هاوتای ڕێبازی بۆرژوازی بوون.. ئای لەو تاوانەم: من خەونم بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاوە دەدیت بۆ مسۆگەرکردنی تەرزە سەربەستییەک وەکی ئەوەی لە فەرەنسادا کرا).

ڕۆژنامەی ((نهان دان)) لە ٢٨و٢٩ی نیسانی ساڵی ١٩٥٨ نوسیبوی: (تاوانی هەرە گەورەی نووسەران ژەهراوی کردنی بیر و هۆشی لاوان بوو ).

"خویندکارانی زانکۆ بە بیروڕای نووسەرانی دەستەی (نهان فان و جیام فام) ژەهراوی بووبوون، لەپاش تەواوکردنی خوێندنشیان بە هەر چوار لای وڵات پەرش و بڵاودەبوونەوە بە مێشکێکی ئاخنراو بە بیروڕای ژەهراوی ئەو نووسەرە کۆنەپەرستانە. بۆیە دەسەڵاتدارانی گوندو شارۆچکەکان ڕوو بە ڕووی گیرو گرفتێکی زۆر دەبوونەوە لە سۆنگەی کارتێکردنی ئەو کۆمەڵە بەد ناو و بەد کارانە".

**کاکڵەی وتارەکە لەو چەند دێرە خۆی دەنواند :**

ئەوەی مایەی نەنگی و شەرمەزاریە ئەوەیە کە بڕوبیانوەکانی کۆمەڵەی (بیتۆفی) لە هەنگاریا و، کۆمەڵەی (پۆپروستۆ) لە پۆلۆنیا و، کۆمەڵە ڕاست ڕەوەکانی چین و، کۆمەڵەی ((نهان فان_جیای فام)) لە وڵاتەکەمان ... هتد.. هەمووی یەک تەرزن و لە یەک سەرچاوە هەڵدەقوڵێن.

ئەدیبانی وڵاتە کۆمەنیستیەکان دوچاری دژوارترین و نالەبارترین و سامناکترین پیشە هاتوون.

## ئەدیبان لەمانای دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ناگەن

لە نێو شەپۆڵە یەک بەدوای یەکەکانی داخستن و والابوون و دیسان داخستنیدا ، نێوەرۆکی ئەو تاوانانە دەگۆڕێن کە ئاڕاستەی نووسەرانیان دەکەن:

١- جوان سازی و نایاب کاری بە لادانێک دادەنرێت رووەو (هونەر لە پێناوی هونەردا) ، هەروەها کۆنەپەرستی و ڕاکردنە بۆ ڕابردوو، بەرەو بابەتە نا سیاسییەکان.

٢- خۆ کێشانەوە لە سیاسەت و، نووسینی ناسیاسی. نووسەران کەنارگیر دەکات، لە قوللە بەرزەکانیان و لەسەر بابەتە کلاسیکییە

گۆشەگیرەکان دەبێتە هەوێنی نوسینەکانیان و ئەنجامەکەشی بەوانە دەگات:

(مێژوو) لە پێشبرکێ بە جێیان دێڵێ. چونکە شان بە شانی (کاتە بەنرخەکانیان ناچن بەڕێوە) بەڵکو (دەبنە کۆسپی بەردەم ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی مێژوو) لە ئەنجامدا دەبنە چەند (گۆشەگیرێکی دوور لە گەل).

(لە کاتێکدا لاوان و کرێکاران و جوتیاران لە ناخی دڵەوە لە ژێر سایەی سەرکردایەتی حیزبە مەزنەکەمان یەک دەگرن، لەو کاتە پیرۆزەدا نووسەران لە دورگەی هونەرەکانیاندا گۆشەگیری دەکەن) هۆی ئەو هەڵە تاوانانەش دەگەڕێتەوە بۆ: ئەوەی نووسەران بە چاکی توێژینەوەی مارکسیزم و لینینزمیان نەکردوە، بۆیە ناتوانن بە شێوەیەکی ڕێک و پێک بیربکەنەوەو لەمانای دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو لە مانای کۆمەنیستیدا بگەن. کە بە بەرزترین پلە لە پەیژەی گەشەسەندنی مرۆڤایەتی دادەنرێت.

بێگومان ئەو تاوانانەش سزای توندیان بە دواوەیە. کە لە ئاکامدا هەندێک نووسەر کۆڵ دەدەن و بە چۆک دادێن، هەندێکیش خۆیان دەدەنە دەست پیلانەکانی حیزب بە شێوەیەکی کاتی، هەندێکی تریشان لە مانگرتنی بێ دەنگییان بەردەوام دەبن.

لە جیهانی کۆمەنیستیدا شەش دەستەی سەرەکی گرنگ و جۆراو جۆرهەن لە نووسەران:

١- لە نووسینی قەدەغەکراوان.

٢- ئەوانەی دەوێرن بنووسن.

٣- ئەوانەی دەوێرن نەنووسن.

٤- ئەوانەی ناوێرن بنووسن.

٥- ئەوانەی ناوێرن نەنووسن.

٦- خۆبەئەدیب و نووسەر زانانی لە فەرمانبەرانی حیزب.

لە ماوەی تۆقاندان و خەفەکردندا تەنیا نووسینەکانی دەستەی پێنجەم و شەشەم بڵاودەکرێتەوە.

لەو ماوەنەدا گەل ناچار دەبێت پەنا بەرێتە بەر ئەدەبی نیشتمانی و ئەدەبیاتی کلاسیکی جیهان.

واش باوە، ماوەکانی سەرکوت کردنی ماوەی واڵابوونی بە دواوە بێت. لە ماوەی تۆقاندن و سەرکوت کردن دا نووسەرە پەسەند کراوەکانی لای حیزب دوچاری رق و کینەی جەماوەر و خوێندکاران و جوتیاران و کرێکاران دەبن. چونکە نووسەری بە کرێگیراو ترسنۆک گۆرە نووسەر گەلێک زۆرن. بەبەڵگەی ئەو شیعرە زۆرانەی کە نووسراون بۆ ستایش کردنی ستالین و ماوتسی تونگ و هوشی منە و راکۆزی و هتد.

لە ڕاستیدا هەندێک لەو نووسەرانە زیاتر مایەی بەزەیی پێداهاتنەوە بوون نەک ڕق لێ بوونەوە، چونکە زۆربەی گەل دان بەو ڕاستیە دەنێن، کەوا نووسەرو ڕۆژنامەنووسان دوچاری دژوارترین و سامناکترین پیشە هاتوون لە ژێر سایەی ڕژێمە کۆمەنیستەکاندا. چونکە ئەوانە تاکە کەسانێکن کەلە توانایان دا هەیە گوزارش بکەن لە نارەزایی و ئێش و ئازارو خواستەکانی گەل.

# به كۆیله كردنی گەل

کاردانەوەی سەرکردایەتییەکانی حیزب لە وڵاتە کۆمەنیستەکان نەک بە تەنیا پێک دەچوون، بەڵکو دەقاو دەق چوون یەک بوون. بەردەوامیش بەزمەکەیان نوێ دەکردەوە بە هەڵبەستنی چەند تاوانێکی نوێ، بەڵام ئەوەی مایەی پێکەنینە لەو باس و خواسە ئەوەیە تاوانە نوێیەکان هەر بە تەواوی بە پێچەوانەی تاوانە کۆنەکان دەبن؛

١- چالاکی سیاسی دژی حیزب. ڕۆمان و شانۆگەری و کورتە چیرۆک و شیعرەکانیان هێرشی سیاسین دژی ڕژێم.

٢- ئەدیبان و نووسەران بیرو هۆشی تازە پێگەیشتوان ژەهراوی دەکەن، هەست و سۆزی خەڵک لە دژی حیزب دەرژێنن. بەقسەی خۆیان دەڵێن (حیزب بەرگری لێکەری ڕاستەقینەی بەرژەوەندیەکانی کرێکار و جوتیاران نییە).

٣- نووسینە ئاشوب گێڕو ڕووکەشکراوەکانیان گەل هان دەدەن بۆ کۆبوونەوە لە دەوری خۆیان. هەروەها گەل دەلاوێننەوەو ستایش دەکەن و فریوی دەدەن بۆ شول هەلکێشان لە دژی شۆڕش.

٤- "پێیان وایە ئەوان لە حیزب چاکتر لە کۆمۆنیزم و لینینزم دەگەن" لە هەمان کاتدا ئابڕوی خۆیان دەبەن کاتێک دەڵێن

دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ڕووپۆشی دیکتاتۆریەتی سەرکردەکانی حیزبە.

لەدوا ماوەی خاوبوونەوەی چنگی تۆقاندن نووسەرە کەنارگیرو دورە پەرێزەکان دەبن بە هێماو مەشخەڵی شۆڕش لە دژی بیروکراتییەتی ستەمکاران .

شیعرو ڕۆمان و کورتە چیرۆک و شانۆگەرییەکان دەست دەکەن بە گوزارش کردن لەبارودۆخی ڕاستەقینەی وڵات: بەو جۆرە پەردە هەڵدەدەنەوە لەسەر فێک و تەڵەکەکانی گزیرە سیاسییەکان ئەوانەی لەجیاتی (بنیاتنانی دوارۆژێکی گەشەدار، گەلیان دەکردە کارەکەر و کۆیلەی دوڵەت).

نووسەران هەست و سۆزی گەلیان جۆش دەدا، چونکە ئەوەی بە چاوی خۆیان دەیان دیت بۆیان دەختسنە قالبی ئەدەب و بۆیانیان بەدیار دەخست، کەوا ژیانی داماو و تۆقێنەریان هەرگیز ناشێت ببێتە بنچینەی بەختیاری مرۆڤایەتی لە ئایندەدا.

هەر چەندە ڕژێم دەیەوێت گەل تێبگەیەنێت کەوا گزیرانی پۆلیس شەڕی چینایەتی دەکەن لە پێناو ئەوان و بەرژەوەندی ئەوان ، بەڵام گەل گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کەوا جەنگی گزیرانی پۆلیس بە تەنیا دژی گەلە و هەر سەرکەوتنێکیش بەسەر چینی بەرهەڵستکار واتە سەرکەوتنە بەسەر گەل زیادکردنی ئێش و

ئازاریەتی گەل دەگەیەنێت. ئەو ڕۆمان و کورتە چیرۆکانەی کە لە ماوەی واڵابوون دا دەنووسرێن باسی ژیانی ناهەمواری کرێکارانی پیشەسازی دەکەن لە پاش هەر بڕیارێکی ساختەی نوێی حیزب بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کارو بەرهەم هێنان و نزم کردنەوەی کرێ ڕاستەقینە. ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی حیزب بەسەر کرێکاران وەکو سەرکەوتن بەسەر چینی دوژمناندا لە قەڵەم دەدرێت.

لە پاش کوشتنی ملیۆنەها جوتیاری دەوڵەمەند واتە (کۆلاکەکان) گزیرانی پۆلیس ڕووی شەڕەنگێزیان بۆ لای ئەو کەسانە وەرگێڕا گوایە (گیانی کۆلاک دەیان بزوێنێ)، مەبەستیان ئەو جوتیارە هەژارانە بوون کە ئاواتەخوازی ژیانێکی باشترن. لە ئاکامی ئەو هەموو کێشمەکێشمەدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا مەبەست لە دوژمنانی گەل هەرگەلە و کەسیترنا.

## ئەدیبان ناتوانن ببن بە بورغی و واشەری بچوک لە ئامێری حیزب

سەرکەوتنەکان بەردەوام بوونة بەسەر بیرمەندە بەیدەست کراوەکان و قوتابییە شۆڕگێڕەکان و، یەکاخورە بەسەر گەلی ڕاپەڕیو، هەروەها بەسەر ئەوانەی حەز بە ژیانێکی کۆنی خێزانی دەکەن، بڕوایان بە پایەندە پیرۆزەکانی خێزان و ڕەوشت و ئاکاری دوور لە شەڕی چینایەتی هەیە، لە سەرووی هەموشیانەوە بەسەر ئەو کەسانەی کە خۆیان ناکەنە بورغی و واشەری بچوک لە ئامێری مەزنی حیزبدا .

دوایی شەڕ دەست پێدەکات دژی (داب و نەریتی کۆن کە هەزاران ساڵە بەردەوامن) کە لە ڕاستیدا جەنگە لە دژی ئاین و نەتەوەو نیشتمان پەروەری. هەروەها جەنگ دەگێڕدرێ لە دژی ڕیالیزمەکان (ئەوانەی واقیعە سەلمێندراوەکان پەسەند دەکەن بەسەر واقیعە لادەرو فریودەرەکانی حیزب).

ئینجا گزیرانی پۆلیس بەردەوام دەبن لە لێدانی دەهۆڵی سەرکەوتن بەسەر گەلدا. لەو هەموو کەین و بەینە بۆمان بە دیار دەکەوێت ئەو دوژمنەی گەل کە ئەوان باسی دەکەن هەر مرۆڤە .

لەو لێکۆڵینەوەیە، کە مەبەستی سەرەکیمان چاوپێخشاندنێک بوو بەو ئەزموونە زۆرەی بەرهەم هێنانی ئەدەبی ئاڕاستەکراو، تەنیا چەند بەڵگەنامەیەکمان پێشکەش کرد، وەک نموونە

لەگەڵ کورتەیەکی دیاردەکانی ئەو گیروگرفتەی کە بابەتی باسەکەمانە. دەبێ هۆیەکی گرنگ و بە هێز هەبێت کە ترس و بیم و دڵەڕاوکێی گزیرانی پۆلیسمان بۆ ڕاڤە بکات لە کاتی دەبەرێک چوونیان لە گەلڕ نووسەران و ئەدیبان و هەنەرمەندان.

هەروەها حیزب کە بێ هودە چاوەڕوانە بلیمەتێک سەر هەڵدات و گوزارشی لە ئاوات و ئامانجی حیزب بکات بە جۆرێکی پێویست. دەبێ لە پشت ئەو چاوەڕوانییە بێ هوودەیە هۆیەک هەبێت. پێویستە هۆیەکی سەرەکی هەبێت کە ئەو دیاردە سەیرەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، بۆچی هەتا ئەدیبە پەیامدارە کۆمەنیستەکانیش ئەو شتە بەرهەم ناهێنن کە حیزب لێیان چاوەڕوان دەکات. لەگەڵ چاوپۆشین لە تێکڕای ئەو هۆ و دیاردانە، من وا هەست دەکەم کە هۆی سەرەکی ئارەزووی سەرپێ نەواندنی تەواوی ئەدەب ناسازی نێوان حیزب و مرۆڤایەتییە. ئەو ناسازییەش دەتوانێ بۆمانی ڕوون بکاتەوە بۆچی حیزب هەردەم دەروانێتە هەر ئەدەب و هونەرێک وەک نەخۆشییەکی کەڤنارو شەڕێکی کۆمەڵایەتی.

لەوانەشە ڕاڤەکەی لەو هەل مەرجە نالەبارە بێت، کە تیوری کۆمەنیستی تێیدا بە شێوەیەکی پراکتیکی جێبەجێکرا، ئەویش ئەزەلیەتی شەڕی چینایەتییە، کەوا پێویست دەکات گەل بەردەوام (دوژمنێکی گەل) هەبێت.

لە پاش قەڵاچۆکردنی چینە دوژمنکارەکان کە لە چینی باڵاو ناوەندی و چینی موڵکداران و پیشەسازان و سەرِافەکان و بازارگانەکان پێک هاتبوون، دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا چەسپێنرا. ئایا شەڕەکە کۆتای پێ هات؟! نەخێر، بەڵکو شەڕەکە گوێزرایەوە بۆ لادێ، چونکە (شێوازی ژیانی جوتیار بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەرەو سەرمایەداری دەبات). بە لەناوبردنی چینی جوتیارە دەوڵمەندەکان و گوزەران ناوەندییەکانیش نەوەستان، بەڵکو ئەو جارەیان چینی دوژمن لە کێڵگە گشتییەکان ڕکەی گرتبوو (اعتصام) دەبا شەڕەکە بگوێزنەوە ئەوێ.

# حیزب جەنگ دژی چینی مرۆڤایەتی دەگێڕێ

مارکسیزم و لینینزم دەڵێت چینی کرێکار ((بەرژەوەندی هەقیقی)) خۆی نازانێت، هەروەها کرێکاران بەبێ کارگێرێکی لێهاتوو زوو دەبنە نێچیری ڕێبازی یەکێتییە بازرگانییە بورژوازییەکان کە دژی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریان، کەوا بوو پێویستە کرێکاران ڕابەرایەتی بکرێن لە لایەن پاسەوانانی پێشەوەی چینی کرێکار: واتە حیزبی کۆمەنیستی پێشڕەو. بەڵام ئەو پێشەواو پێشڕەوانە ناتوانن ڕۆڵی سەرکردایەتی و ڕابەرایەتی کردن بگێڕن ، چونکە کەس و ئەندامانی حیزب بە بێ سەرکردایەتی ناوەندی باڵا توشی دووبەرەکی حیزبایەتی و شیرازە پچڕان دەبن. چارەسەریشی بریتییە لە (ناوەندێتی دیموکراتی) (ئەوەش ناوێکی ڤیستقاڵییە دەیانەوێ لە ڕێگایەوە ئەندامانی حیزب حوکم بکەن بەهۆی دەزگای حیزب) ئەو چارەسەرەش هەموو جۆرە جموجۆڵی سیاسی و گفتوگۆو لێکۆڵینە لە ئەندامانی حیزب وەیاساغ دەکات. هەر پرسیارێک پەیوەندی بە ڕێبازو جێبەجێکردنی هەبێت ڕەوانە دەکرێتە سەرکردایەتی ناوەندی تا تەمومژی لەسەر لابرێت، جا ئەو سەرکردایەتییە ناوی بولیتبۆرۆ بێت یان بریزیدیۆمی حیزب بێت یان هەر ناوێکی تر بێت ، بەڵام دوژمنانی گەل هەر لە گۆڕێ دان و نابڕێتەوە هەتا لەناو ئەو لاشە قەبەو زلەشدا، بەڵکو لە ڕیزی پێشەنگی پرۆلیتاریاش هەن.

هەر ئەندامێکیش لە ئەندامانی حیزب دوژمنێکی چاوەڕوان کراوە. کەوابوو دەبێ دەم نادەم پاکسازی ئەنجام بدرێن....

بۆیە جوتیاران و کرێکاران و ئەندامانی حیزب و ئەندامانی بریزیدیۆم بەپێی پێناسەی تیوری پراکتیکی (دوژمنی چاوەڕوانکراون)، چونکە دوژمن هەر کەسێکە ئەگەر ئامێرێک و نوێڵێکی مل کەچ نەبێت لە ژێر چنگی ئەو دیکتاتۆرەی کە لەسەر لوتکە چوار مەشقی دانیشتوە. لەو کێشەیەشدا نووسەران و هونەرمەندان بەیدەست و کەوی ناکرێن بەئاسانی، چونکە نووسەران و هونەرمەندان لەسەر سروشت و ئامانجی مرۆڤ، لەگەل گزیرانی پۆلیس هەرگیزاو هەرگیز رێک ناکەون .

چونکە لە ڕاستیدا ئامانجیانە مرۆڤ هەر وەک مرۆڤ بمێنێتەوە .

# ناوەڕۆك

**وەرگێر لە چەند دێڕێك:**
**محەمەد هەریری**



★ محەمەد یوسف لە ساڵی ١٩٦٦ لە هەولێر دایکبووە. لە بواری نوسیندا بە "محەمەد هەریری" ناودێر کراوە. کۆلێژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانکوی سەلاحەدین تەواو کردووە، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.

★ لە کۆتایی هەشتاکانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیکری و کۆمەڵایەتی.

★ لەساڵی ١٩٩٥ کۆچی هەندەرانی کردووەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. سەرنوسەری رۆژنامەیەکی کوردی و گوڤارێکی عەرەبی بووە، بە کوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت.

بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە کوردی و عەرەبیەکان، وەك نوسەرێکی کوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو کێشانەی لە گۆڕەپانی کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.

★ سەرەکیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوکراوەی هەیە. توندڕەوی دینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەکانیەوە. بەڕای نووسەر خوێندنەوەیەك و فکرێکی نامۆیە بە سروشتی دینداری کوردی، ڕاستە لە کۆنەوە کەمێك چەمکەکانی لە ڕێگای مەزهەبی شافیعیەوە هاتۆتە ناو کورد، بەڵام وەك ئەو لێشاوە سەلەفیەتە نەبووە کە جێگای مەترسی جیدی بێت لەسەر ڕووحیەتی دینداری کوردی. نووسەر پێی وایە دەبێت

کورد ڕزگاری بێت لە هەموو فۆرمە ئیسلامە نامۆکانی عەرەبی و غەیری عەرەبی، خاوەن دیدو خوێندنەوەو فۆرمی تایبەتی خۆی بێت.

★ هەروەها لە بواری ڕەخنەی سیاسیش دەنووسێت، بە تایبەتی لەسەر ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی. نوسەر خەبات لە پێناو بەرقەرابوونی دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ لە کوردستانی باشووردا دەکات، کە پێی وایە هەنگاوێك لە پێش بەشەکانی تری کوردستانە ودەبێت خەباتیشی جیاواز بێت لە بەشەکانیتر. لە کاتێکدا بەشەکانیتر هێشتا لە قۆناغی خەباتی ڕزگاریخوازیدان، کوردستانی باشوور تا ڕادەیەکی زۆر ئەو قۆناغەی تێپەڕاندوە.

## بەرهەمەکانی:

١- داعش کێیە و مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت.
٢- ئەدیب وگزیری پۆلیس کێشەی ئەدەب وسیاسەت لە وڵاتە سۆشیالیستەکان ... وەرگێران.
٣- خوێندنەوەیەك لە کتێبی ئەو (حەسەن بەنا) یەی کە کەس نایناسێت.

کتێبی داهاتووی نووسەر (ئافرەت لە نێوان سەرەڕۆیی فێمینیزم و توندڕەوی ئاینیدا)

لە کۆنەوە جرو جانەوەرە دڕندەکان
وڵات داگیر دەکەن دەم نادەم
دز و جەردەکان ئێسک و پەیکەری گەل
بەتاڵان دەبەن
بۆ بازرگانی پێکردن
فەرمانڕەواکانیش هەردەم مەعسومن
دوای دەبنە ملهوڕی ستەمکار
تاوانەکان لە کۆشک و تەلاریان هێلانە دەکەن
درۆکان لەسەر کورسییەکان
بۆ هەتا هەتایی چاولێک دەنێن
دەیانەوێ گەل بنوێ
تا وەک ئاژەڵ ڕاپێچی کەن
بەڵام گەل زەینی ڕوونە
هەرگیز زامەکانی لە یاد ناچێ

فرانتسك نشفتال

دەزگـــــای راگـەیانـدنی سـتاندەر 2015
www.skurd.net info@skurd.net
ستاندەر STANDARD